



# کەسێ
# کە هەموو
# ژیانی شیعرە

دیمانەی : نازم دڵبەند
لەگەڵ شاعیر کەریم دەشتی

٢٠٢٣

# کەسێ

# کە هەموو ژیانی شیعرە

دیمانەی نازم دڵبەند

لەگەڵ شاعیر کەریم دەشتی دا

١/٨/٢٠٢٢ -١/١/٢٠٢٣

هەولێر ٢٠٢٣

ناوی کتێب: کەسێ کە هەموو ژیانی شیعرە
بابەت: دیمانە: لەگەڵ کەریم دەشتی شاعیردا
(سازدانی: نازم دڵبەند)
دیزاینی بەرگ: عوسمان پیرداود
دیزاینی ناوەڕۆک: سەید ئارام
چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٢٣
تیراژ(٥٠٠) دانە
چاپخانە:
ژمارەی سپاردن (١٢٩) لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان
هەولێر: ٢٠٢٣



نازم دڵبەند لەگەڵ کەریم دەشتی شاعیردا

# پێشەکی

**نازم دلبەند**

مـن بە عەشـقی شـیعرەکانیەوە بـوو، کـەریم دەشـتیم ناسی، ئەو کاتەی کە لە هەرەتی گەنجێتی شیعر نووسیندا بوو، هەر ئەو کات دەمزانی هەلکشانی شەپۆلی شیعری ئەو شـاعیرە ، ڕۆژێ لـە ڕۆژان ئـاوێزانی قەڵەمی مـن دەبێـت و دەبێت بە بەشێک لە بزواندنی هەستی خۆشەویستیی من بۆ شـیعر ، پەیوەنـدی مـن و کەریـم دەشـتییش کە پەنجـا سال هەلکشان و داکشانی گرتۆتە خۆ، بەڵام هەرگیز شیعر نەیهێشتووە، کە ئاگردانی پتەوی ئەم پەیوەندییە ئەدەبی و کەسـێتییە کـوێربێتەوە، پێشـناچێ وەهـا زوو لە بیرمـان بچێتەوە، دیارە ئەمەش خۆشەویسـتی بەردەوامی دەشتیی بـوو، کـە بنـەمای ئەو پێناسـەیەی پتـەو کـرد و هەر بە زینـدوویی هێشـتییەوە، بـۆیە نەدەکـرا، لە ئاسـت دەقـە شیعرییەکانی ئەودا بوەستم و جوانیی ئەو هەموو شیعرانە فەرامۆشـکەم، ئەمـانە هەمـووی بـۆ مـن بـوونە پرسـیار و یادەوەرییەکی سیی و پڕ لە جووڵە، تا لە گەرمای هاوینی ئەمسـاڵدا و لەسـەر مـێزێکی ژێـکەلانەدا، هەردووکمـان لە پەنـای دوو پەرداخی ئـاگراوی یەکـتر ببینیـنەوە و بە چـرپە وەکو دوو تێنوومەندی شیعر، هەموو ئەو یادەوەرییانە لە ئـامێز بگـرین و پـێکەوە ڕووبەڕوو بیـانوروژێنین و منـیش

بەدوای وەڵامەکانیدا بکەومە ڕامانەوە، ئەمەش لەوەوە هات، کە دەشتی باسی خەمی نیشتیمان و جوانیی و عەشق خۆشەویستی دەکرد، لەوێدا بزۆزی ڕۆژنامەنووسییم بە گوڕتربوو، بۆیە بە هێمنیەوە چوومە ناو بیرکردنەوە و هەڵبژاردنی هەندێ پرسیار، لە مەڕ گەورەیی شیعر لای ئەو، ئەمەش چەند مانگێکی خایاند هەر ڕۆژەی پرسیارێک و دووان و سێ، هەندێجاریش زیاتر، ئەوەندە دڵخۆشبووم کە دەشتی قەڵەمەکەی بۆ وەڵامەکان دەخستە گەڕ، ڕستەو پیت و وشە وەك باران هەڵدەڕژان، تا گەیشتە ئەوەی هەندێجار بکەوینە مشتومڕیش و هەندێجاریش وچان و وەستان، تا دوا قۆناغ ، بۆیە دەڵێم: مادامەکێ دەشتی شیعری خۆشدەوێ:
**کەواتە هێشتا شیعر لە کوردستان من ماوە.**

**هەولێر ٢٠٢٣**

- ئێستاش دیوانی - خاك و هەڵۆ-ی ساڵانی هەشتا، بە شێوە و ناوەرۆکی خۆیەوە، لە بەرچاوی خوێنەران و لەبەردڵیان، هەر وەکو خۆی ماوەتەوە، نهێنی دینامیکیەتی ئەو دیوانە لە چی دایە؟

دیـوانی خــاك و هــەڵۆ دیـوانێکی شــیعریی بچووکــە و لەبەرگەکەی نووسراوە بە سەد فلسە، لە هەشتاکاندا، لە لایـەن دەزگـای رۆشـنبیریی چـاپ و بڵاوکردنـەوەی بەغـدا چاپکراوە، چاپکردنی ئەو دیوانە لە سـەردەمێکدا بـوو، کە رژێمی گۆڕبەگۆڕی بـەعس، مەسـتی سـەرکەوتنەکانی بـوو بوو، بەسەر بزووتنەوەی رزگاریخوازیی گەلی کورد، کە پێی وابـوو تاهـەتا هـەر ئەوەی بۆ دەچێتە سـەر، نەیزانی ڕۆحی شـۆڕش لـە شـاخدا، چەنـد بـەهێزەوە زینـدوو دەبێتـەوە، هەروەها لەوان دەماندا زۆر بەهێزیش سەری هەڵدایەوە، جا دەرچوونی دیوانێ کە پڕ بێ لە شیعری خۆشەویستی بۆ خــاك و نیشــتیمان و بــە ســتایلێکی شــیعری هاوچــەرخ و زمـانێکی روون بـۆ خوێنـەران، وەکـو دۆزینـەوەی ئـاڵتوونی هەنگوین بوو لە بنی شووشەودا، بە تایبەت کە ئەو کات مەددی شۆرشگێریی بوو لە کوردستان، هـەر بۆیەشـە کە ئـەم دیوانـە تـاوەکو ئێسـتاشی لەگەڵـدابێ، نـە خوێنـەران لەبیریان دەچێ و نە منیش پیموایە تەواو بووبێ، راستییەك هەیـە نـابێ فـەرامۆشی بکـەین، ئـەویش ئەوەیـە، کـە دەق شیعری باش، تۆوی بەردەوامی خۆی لە ناخی ڕستەکانیدا هەڵدەگرێ، جا لە هـەر سـەردەم و زەمانێکدا بێت، من لە دیمانەیـەکی تـردا بـە درێـژی بـاسی کـەش و هـەوای ئـەو ســەردمی دەرچــوونی دیــوانی خــاك و هــەڵۆم کــردووە، بە تایبـەت لـە کتێبی کۆکردنـەوەی شـەونمی شـیعردا، لـە دیوانی خاك و هەڵۆدا خۆشەویستی خاك و خۆشەویستی ژیان و ئـافرەت، بـە یـەك بەنـدی ئەشـق نـووسراوەتـەوە،

ناكات لەكاتی خوێندنەوەدا، خوێنەر جیاوازی ناكات، لە میانی هیچ یەك لەو سێ بابەتە سەرەكییەی شیعر، بۆیە ئەم دیوانە تاوەكو ئێستاش، هێزی كاریگەرێتی خۆی لە دەست نەداوە، شتێكی دیكەی هەوڵدان هەیە، لەمەڕ چاپكردنی یەكەم دیوانی هەموو شاعیرێ، هەڵبەت شاعیرە باشەكان، ئەویش ئەوەیە، كە شاعیر هەوڵدەدات هەموو هێزو برستی شاعیریەتی خۆی، لە نێو دیوانی یەكەمیدا گەڵاڵە بكات و پیشانی خوینەرانی بدات.

من هەر لە دیوانی خاك و هەڵۆ وە دەمزانی كە شیعر ئاگرە، كە ئاگرمان دەست نەكەوێ، ناچارین بە هەڵمەتێكی پرۆمیتۆسیانە دەست بە دزینی ئاگر بكەین، لێرەدا شاعیر ئەگەر دزێكی گەورە نەبێت، ئەزموونی دزیكردنی خەللاق نەبێت، ناتوانێت بچێ بە گژ زەیوسەكان، ئەو گەوهەرە جوانانەی لێبدزێ، دزینی تیشك و ئاگر، كە رەمزی شیعر و ئەبەدییەتی داهێنانە، دەخوازم بڵێم قۆستنەوەی تۆوی داهێنان، تەنها كاری شاعیرە ڕاستەقینەكانە، كە لە ژێر پیرۆزییەتی شیعردا دەژین.

وەك باسم كردووە، دوای چل ساڵ لە شیعر و شەونخوونی و ئازاری ڕاستەقینەو هەڵدانەوەی هەزارەها هەزار كتێب، لە یادی لەچاپدانی یەكەم دیوانی شیعریم، چی دەربارەی شیعر بڵێم ئەی ئازادی؟

زۆر شت هەن، كە كات و ساتی خۆیان دێت.

- شـيعر چييـه و بـۆچی شـاعیران هێنـدەی بـه دويـدا دەگەڕێن و تەنانەت تەمەنی خۆشیان لەسەریا دادەنێن و ئامادەن تا پای مەرگ لە گەڵیا ئەم ڕێگەیە ببڕیون ؟

هەر خۆی ئەمە پرسیارە سەختەکەیە، کە مرۆڤ تاکەی گیرۆدەی لەززەتباری شیعر دەبێت، یاخود شیعر چییە کەوا مرۆڤ تاوەکو ئێستا، ئاوی جاویدانی و نەمری لێ دەخواتەوە؟ هەرخۆی ئەو پرسیارانەی دەربارەی شیعر دەکرێن، جۆرێك لە گرفتی لێکدانەوەیە، لای من شیعر پەیامی ئێستەتیکی و ژیاریی هەیە، ئەو پەیامەش پەیامێکی دروشم بەند و حەماسگۆیی نییە، بەڵکو پەیوەستە بە زات و ناوەوەی ئینسانی شاعیر، واتە شاعیر بۆ گریان و کرانەوەی ناخی خۆی دەنووسێ، کە نووسینەوەی ناخیش، هەندی جار کۆکە لە گەڵ ناخی خوێنەردا، هەمان ئەو ناخەی شاعیرە، هەوڵ دەدات ژیان جوان بکات، یا مانایەك ببەخشێت بە مانەوەی مرۆڤ، کەواتە شیعر هەوڵێکە بۆ گۆڕینی بیرکردنەوەی ئەندێشە و لێکدانەوەی مرۆڤ، لە بارێکەوە بۆ بارێکی دیکەی جوانتر، ڕەنگە بپرسن شیعر چۆن دەتوانێ ژیان و مرۆڤ بگۆڕێت، ئایا هێزی شیعر چییە؟ تا بتوانێ و ئەو ناخەی ئەوانی دیکە هەڵتەکێنێ؟ ئەنگیزەی یاخود هەنجەتی شاعیر بۆ مانەوەی لە ناو دونیای شیعر هەر ئەوەیە، لەوەتەی مرۆڤ هەیە شیعر هەبووە، تا دونیاش بمێنێ شیعر هەر دەمینێ، کە شیعر پەیوەست بێ بە دڵ، تا ئەو دڵە دەوەستێ کەلکەڵەی نووسینی شیعر، سەری شاعیر هەڵدەکوڵێ، کە دەڵێن ئەقڵ بۆ خۆراوایە و دڵیش بۆ خۆرهەڵاتە، گوایە خۆر ئاوا دوورە لە شیعر و خۆرهەڵاتیش لە نێو شیعر و خەیاڵ دەژیت، پیم وانییە لە

هەموو ڕووەکاندا ڕاست بێت، چونکە خۆراوا کە ئێستا لەو پەڕی پێشکەوتن دایە، بەڵام شیعر تیمەیەکی گرینگە لە ژیانی شاعیرانیدا و هەر ماوە، شیعر نە پەیوەستە بە ئایدیایێکی ئاینییەوە، نە پەیوەستە بە تەکنۆلۆژیاوە، بەڵکو پەیوەستە بە دڵ و ئەقڵی مرۆڤەکانەوە، لەبەرداشی کۆتاییشدا، شیعر هەوڵدانە بۆ بەرجەستە کردنی مرۆڤایەتی، هەر ئەوەشە شاعیرانی ڕاستەقینە بەدوایدا دەگەڕێن، لە ڕێگەی ڕستەیەکی ئێستەتیکی و ڕۆحێکی ژیاریدا، تا بەردەوامی ببەخشن بە جیهان و دەنگە دوورەکان بگاتە ئەوسەری دونیاوە، بەلایەوەش گرینگ نییە، کە نووسینی شیعر ئەیگەیەنێتە چ چارەنووسێکەوە، کۆی قسەکانم لەوەدا کورت دەکەمەوە، کە شیعر هیومانیزمییەتە، لە پێناو ئینسانە، لە پێناو سارێژکردنی ئەو برینانەوەیە کە سینەی مرۆڤیان سوورخن کردووە. لە پێناوی هێنانەدی جیهانێکی خۆشتر لەو جیهانەیە، دوا جار شیعر بۆ من بە درێژایی چل ساڵ ، تەنها ئەو کەشتییە ئەفسووناوییە پڕ لە گەوهەرە نەبووە، کە من خۆم بۆ لە دەریا و زەریاکان داوە، تەنها ئەو هەڵۆ سپییە نەبووە، کە من بە دوایا کێوی سەخت و ڕەوەزی دوورم بۆ بڕیوە، بەهەمان پێوانە ئەو پشکۆ نادیارەی یاقووتیش نەبووە، کە من لە پێناویا خۆم بەناو ئاگرا داوە، بەڵکو شیعر بۆ من جگە لەوانە ، ڕسکاندنی هەموو ئەو ئەو دەنگ و هاوارانەیە کە لەناخی مندا، وەك شەپۆل گینگل ئەدەن و بەرەو چوونە ناو نوور و ڕووناکی هانم ئەدەن، تا بمکەن بە

فێرژیل و ببم به ڕێشانده‌ری هه‌موو ئه‌و کائیناتانه‌ی ناو سینه‌م و به‌ره‌و لوتکه‌یان ببه‌م ، نادیارییان بۆ به‌رمه‌لا بکه‌م و بیانده‌مه ده‌ست ڕه‌ها.

**- دوای ماڵئاوایی شێرکۆ بێکەس،هەمیشە دەنگۆی ئەوەهەیە،گوایە تا ئێستا کەس شوێنی ئەو یان تەجاوزی ئەوی نەکردووە، شاعیرەکانیش، لە ئاست ئەم دەنگۆیە بێدەنگن، ئەمە تاچەند پشتڕاستدەکەیەوە؟**

هەمیشــە دوای کــۆچی هەر شــاعیرێك، یــا هــەر داهێنــەرێ، کە ئەزمــوونێکی دوور و درێــژی لــە شــیعردا هەبێت لەگەڵ خوێنەرەکانیدا، هەمان ئەو دەنگۆیە دوای کــۆچی ئەو کەســە بــڵاو دەبێــتەوە، هــۆیەکەشی ئەوەیە، چونکە هەمان ئەو شاعیرە خۆشەویستیی خۆی لە ڕووی شــیعرەوە، لەنــاو دڵی ئەو کەســانەدا چانــدووە، بــۆیە زۆر ئاساییە کە ئەمجۆرە دەنگۆیانە بڵاو ببنەوە، بەڵام خودی شــێرکۆ بەم جــۆرە بیروڕایــانە رازی نــەدەبوو، ئەگەر لــە ژیاندابایــە، چــونکە شــێرکۆ شــاعیرێکی رۆشــنبیر بــوو، زۆر بە شــارەزایی مــامەڵەی لەگەڵ ئەم بیروڕایانە دەکــرد، مــن زۆر لە نــزیکەوە شــارەزای ئەندێشــەی شــێرکۆی شــاعیر بــووم، کــاتێکیش کە بێــدەنگیی هەبێــت لەم ڕووەوە بەو مانــایە نایەت، کە هیچ وەڵامێک لە ئارادا نەبێ، چونکە پرۆسەی شــیعریی پرۆســەیەکی دینامیکییــە، قبــووڵی وەســتان و سەقامگیری ناکات، لەنێو ڕەحمی پرۆسەیێکی دیالیکتیکیدا دەژێت، یەکێ لە فەیلەسووفەکان کە هیراکلیتسە دەڵێت ، تۆ ناتوانی دووجار لە ناو هەمان ڕووباردا مەلە بکەیت ، مەبەستی گۆڕانی بەردەوامە، هەر بۆیەش ناکرێ بڵێین بە مەرگی کەســێک ئەم پرۆســەیە دەوەســتێت، شــیعر ناوەستێ، نوێ بوونەوە ناوەستێ، ئەگەر وەستان هەبوایە، ئەوە دوای کۆتــایی هــاتنی قۆنــاغی نــالی، شــیعری تــازە نەدەهــاتە کــایەوە، یــا دوای مەحــوی دەوەســتا، یــا دوای دانــتێ، ئیــدی داهێــنەرێکی دیــکە نەدەهــاتە کــایەوە، لەم ڕووەوە نموونەمان زۆرە، بۆیە مەرگی شێرکۆ مانای کۆتایی

هاتن و وەستانی شیعری کوردی نییە، ئەو کاری جوانی خۆی لە مەودای شیعری کوردیدا کرد و تێپەڕی، نەوەکانی دوای ئەو لەنێو سرووتەکانی شیعری پێش خۆیان دەژین، بەڵام مەرج نییە کۆپی ئەوان بن ، وەک دەڵێن کە مەسەلەیێکی رووسییە، کەسێ بەسەر گۆڕستانەوە وەستا بوو، دەیگوت ئەوانەی ژێر ئەم گۆڕانە وایان دەزانی دوای ئەوان کارەکان هەڵناسوورێن، بەڵام دونیا نەوەستاو هەر بەردەوامە. لەدوای مردنی کەسێ دونیا ناوەستێ، هێشتاکە زۆر شت ماوە نەنووسراوە، کە هەرگیز کۆتاییان نایەت، کەواتە شێرکۆ وەک شاعیرێکی گەورە کۆتایی رێگە نییە، رەنگە شاعیرانی زۆر مەزن بێنە کایەوە و درێژە بە رێگەی ئەو بدەن، یا رێگەی تایبەتی خۆیان هەبێت.

- زۆر گوتاری ئەدەبی لەمەڕ شیعرەکانی تۆ نووسراوە، تا چەند هاو ئاهەنگ بووینە لە گەڵ شیعرەکانی تۆدا؟ هەستم کردوە کە باس لە شیعر دەکرێت هەمیشە ناوی تۆلە پێشەوەی ناوەکاندایە ، تۆ چۆنی دەبینی؟ هەروەها لەپاڵ شیعر وەرگێڕانیشت هەڵبژارد، ئەوەی تێبینیم کردبێ، یان ئەو کەسانەی لەسەر بەرهەمەکانتیان نووسیوە، لە کامەیان تۆیان زیاتر لە داهێنان یان رای جیاواز پێناسە کردووە؟

به دریژایی تەمەنی خۆم، ئەوەی بۆی دەژیم و بۆی ژیاوم شیعر بووە و لەو پێناوەش قوربانی زۆرم داوە و تەنانەت ژیانی خۆشم لەو ریگەیە لە بیر کردووە، شیعرلای من ئامانجە، ئامانجی ئینسانیبوونە، ئینسانیبوونیش پاکی و خۆشەویستییە، تۆ باش دەزانی من هەموو ژیانم شیعر بووە، ژیانێکی خۆشم هەڵنەبژارد، بەڵکو ژیانی سەختی ئەدەبیاتم هەڵبژارد و لەو رێگەوە تووشی گەلێ کارەساتی دەروونی و ناهەمواری بوویمەوە، ئاوارەی وڵاتان بوویمە و لە پێناوی ئەو سومعەیەدا، وازم لە هەموو جۆرە ژیانێکی خۆش هێناوە،، بۆیە بۆ من شیعر ئامانجی ژینم بووە، هۆکارێك نەبووە بۆ هیچ شتێ، ئەوە کاری راستەقینەی ژیانی شاعیری راستەقینەیە، ئێستا شیعر بۆتە ئایینی من، ئەوانەیش دەیانەوێ لە ناو شیعر و ئەدەبیات ساغ ببنەوە، دەبێ واز لە زۆر شتی خۆیان بهێنن، راستە من کاری وەرگێڕانیشم کردووە، بەڵام من وەرگێڕ نیم، ئەوەیش کە بەرهەمم هێناوە، ئەوە بووە، کە پێم خۆش بوو وەك چۆن من لەززەتم لەو بەرهەمانە وەرگرتووە، کە خوێندبێتمەوە ، حەزم کردووە خەڵکان و خوێنەری تریش لێی بێ بەش نەبن، جا یا ئەوەتا سوودی بۆ کێشەی نەتەوەکەم هەبووە، یا بۆ پرۆسەی تازەکردنەوەی ئەدەبیاتی کوردی بووە، بۆیە کارم تیا کردووە و بۆ زمانی خۆم وەرمگێڕاون، خەڵکانێکی زۆر سەبارەت بە شیعرەکانی من گوتارو وتاریان نووسیوە، کە گوزارشتیان لە رای خۆیان کردووە، ئەوەیش دەیسەلمێنێ کە من کارێکی بە جێم کردووە، لە نێو رەوتی

شیعری کوردیدا ، چ بە نووسینی دەق شیعریی بێت، یا بە نووسینەوەی تیوری بێت، دەربارەی شیعر، بۆیە وتارگەلێکی رەخنەیی زۆرم لەسەر نووسراوە، کە دەڵێم رەخنەیی مەبەستم گوتارە، رەنگە ئەگەر کۆیان کەمەوە، کتێبێکی قەبارە گەورەی بە چەند بەشی لێدەربچێ، نامەوێ باسی چاك و خراپی ئەو نووسینانە بکەم، بەڵام هەموویان لە بەرداشی کۆتاییدا، لە بەرژەوەندی من دەکەونەوە، ئەلێرەوە پێویستە سپاسیان بکەم، ، کە کاتێکی بە نرخی خۆیان بەخشیوە بە شیعرەکانی منەوە، حەزدەکەم ئەوەت پێ بڵێم، زۆربەی ئەوگوتارانە، لە لایەن نووسەرە دیارەکانەوە نووسراون، بۆ نموونە، عەتا قەرەداغی ، فازیل شەورۆ، نەجات حەمید، زانا خەلیل، نازم دڵبەند، بۆتان جەلال، سامی هادی، تریفە ، مەسعود پەرێشان، رەفیق غەفور، دڵشاد کاکی، هاشم سەراج، موتەلیب عبداللە، ، شوکرسەعید، گەلێکی تر، کە نایەنەوە خەیاڵم و خۆشم ئەرشیفیانم نەکردووە، جگە لە نامەی دکتۆرا ، کە بە کتێب چاپکراوەو بڵاو بۆتەوە، لە ژێر ناوی فەلسەفەی شیعرو شیعری فەلسەفی، لە لایەن دکتۆر سەنگەر قادرەوە، هەروەها گەلێ شاعیری ناوداریش بیروڕای خۆیان بە نوسین لەمەڕ شیعرەکانم بڵاو کردۆتەوە، وەك ئازاد عەبدولواحد و ئەنوەر شاکەلی و شێرکۆ بێکەس ، گەلێکی دیکە، سەبارەت بە ناوی من کە لە پێشەوەی ناوەکان هاتووە، ئەوەیان نازانم، من بۆخۆم هێندە موبتەلای ئەوە نیم لە ریزی پێشەوەدا بم یا لەڕیزی دواوەی شاعیراندا،

زۆر لەجۆرە بیرورایانە دوور کەوتوومەتەوە، شیعر خۆی پێناسەی خۆی دەکات، جا تۆ ناوت لە دواوەی شاعیرەکان بێت، یا لە پێشەوەی شاعیراندا، ئەوە شیعرەکەیە ئەو هەلبژاردنە دەبڕێتە بەر باڵای ئەو شاعیرە، تەنها بەرهەمی باش و دەق پالاوتەیە، کە شاعیر بەرز دەکاتەوە و خوێنەر بە چاوێکی گەورە سەیری دەکات و پایەی پێدەبەخشێ، خۆ نالی بە پێوانەی خوێنەران نەبۆتە ئەو شاعیرەی کە پایەیێکی بەرزی هەیە، ئەوە شیعرەکانیەتی، پایەی ئەویان بردۆتە ئاسمان.

**- گرووپی روانگە سەری هەڵدا، ئایا ئێستا هیچ گروپێکی شیعری هەیە، خۆیان لەم رۆژەدا بەمجۆرە بابەتانە ناو زەدبکەن؟ ئەگەر هەن، تۆ وەکو شاعیرێکی دیار، تاچەند لەگەڵیانی یان دژایەتیان دەکەی؟**

له مەڕ بزووتنەوەی ڕوانگە، کە زۆری لەسەر نووسراوە و خۆشم زۆر جاران باسم کردووە، ڕاستییەك هەیە ناشاردرێتەوە، ئەویش ئەوەیە کە ڕوانگە پێداویستییێکی ئەدەبی بوو، بۆ سەرهەڵدانی قۆناغێکی تازە لە شیعری کوردیدا، دوای قۆناغی گۆران وشێخ نووری شێخ صالح و پیرباڵ مەحمود و مەدحەت بێخەو و کەریم شارەزاو عەین شەونم و کاکەی فەللاح و ئەوشاعیرانەی کە لە ریزی مێژوویی ئەوانەدا بوون، هەرچەند دەستەی ڕوانگە، وەك خۆشیان دەڵێن، هەوڵیان داوە وەك جەماعەتی شەست و نۆی شیعری عەرەبی کارێ بۆ نوێبوونەوەی شیعری کوردی بکەن، بەڵام دیدگاو بینینیان جیا بوو، چونکە دەستەی ڕوانگە لەژێر کاریگەرێتی باروزروفی ناهەمواری سیاسیی کوردبوون و بە دوای ئازادی دا دەگەڕان، تا رادەیەکی زۆر باش توانییان، خۆیان وەك بزووتنەوەیەکی شیعری لە ناو ڕەحمی ئەدەبیاتی کوردیدا بچەسپێنن، هەلبەت توانیشیان گوێچکەی خوێنەری کورد بە شیعری تازەو هاوچەرخ ڕابهێنن، کە پێشتر بە شیعری کلاسیك و شیعری نەوەی گۆران ڕاهاتبوون، زۆربەی شاعیرەکان کەوتنە ژێر کاریگەرێتی ئەو بزووتنەوەیە، ڕازی بن باخود نا، هەمان ئەو بزووتنەوەیە بەرهەمی خۆیان بڵاو کردەوە و دەقی جوانیشیان پێشکەش کرد، بۆیەش دەتوانرێ وەك بزووتنەوەیەکی شیعری، لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا بژمیردرێ، چونکە بەیانی تایبەت بە خۆیان هەبوو، گۆڤاری تایبەت بە خۆیان هەبوو، بەرهەمێکی زۆریان بڵاو

کـردەوە، داکۆکیـان لـە خۆیـان دەکـرد، پاشـان پـرۆفیلێکی نەتەوەییشیان هەبوو، ئەمانە هەمووی وایکرد خۆی لە ناو مـێژوودا بـە زینـدوویی بهێلێتـەوە، بـەڵام خـۆ ئـەو کاروانـە بەوەندە ناوەستێ ، هەڵبەت لە دوای ڕوانگەوە بزووتنەوە و دیاردەی ئەدەبی زۆر سەریان هەڵداوە ، بەڵام بەداخەوە بەرنامەی تایبەتی خۆیان نەبوو، کە وەکو ڕوانگە لەسـەر پێی خۆیـان بوەسـتن، سـەبارەت بـەوەی کـە ئاخۆ گـرووپی دیکـە هـەن لـە ئێسـتادا؟ هەڵبـەت وەکـو گـوتم زەمـەن ناوەستێ و هەوڵە ڕۆشنبیرییەکان ناوەستن، بۆیە ئەم جۆرە گـرووپ و بزووتنــەوە ئەدەبییانــەش ســەرهەڵدەدەن و سەریان هەڵداوە، من بە دوورو درێژی باسی ئەو گروپ و بزووتنەوانـەم کـردووە، لـە یـەك لـە ژمارەکـانی گۆڤـاری نووسەری کورد، بۆیە نامەوێ دووبارەی بکەمەوە.

- وێنـای شـیعری کەسـانی دی یـان شـیعری شـاعیرانی غەیـرە کـورد، هـیچ جارێـک بـۆتە هەوێـنی نووسـینی شـیعرێکت، بەتـایبەتی هی فـارس یا هی عەرەب؟ ئەگەر هەبووبێ لای خۆت، ئەم شیعرە چۆن بینراوە؟

لە مەڕ ئەوەی کە ئایا بووە، بکەومە ژێر کاریگەرێتی دیمەنێکی شیعریی شاعیرانی عەرەب یا فارس یا تورك یا هەر نەتەوەیەکی دیکە، ئەوەیان شتێکی زۆر ڕوونە، کە هەموو شاعیرێ لە کاتی خوێندنەوەی خۆیدا، بە زۆر شیعری شاعیرانی دونیا سەرسام دەبێ و کاری تێدەکەن، ئاخر شاعیر لە ئەنجامی خوێندنەوەی بەردەوام، دەبێتە خاوەن دید و دیدگای شیعری خۆیەوە، ئەگینا، هەر بەتەنها بە خوێندنەوەی شیعری خۆمان، ناتوانین گۆڕانیك لە ئەتموسفیری شیعرەکانمان بکەین، بەڵام کاتێکیش کە سەرسام دەبین بە ئەدەبی دونیا، ئەوە بەو مانایە نییە، کە بێین و وەکو ئەوان بنووسین، بەڵکو دەبێ بەرهەمهێنەری دەق تایبەت بە خۆمان هەبێت، لە نێو گەلانی تورك عەرەب و فارس، شاعیر و نووسەری بەرزو بە توانا هەن، بەرهەمگەلێکی زۆری ئەوان کەوتۆتە بەر دیدی ئێمەی شاعیرانی کورد، هەڵبەت لە کاتی خویندنەوەیانا شاعیر بیرۆکەی تری شیعری بۆ پەیدا دەبێت، کە لە ڕووی فۆرم و ناوەرۆکەوە زۆر جیاوازن، چ شاعیرێ لە ئیمە ناڵەی جودایی هێمنی شاعیری نەخوێندۆتەوە، کە لە ژێر کاریگەرێتی شیعری رومی نووسیویەتی کە دەڵێتن : **بشنو از نی چون حکایت میکند** بەڵام بە نەزم و ریتمی ناوەرۆکێکی دیکەوە، کە جیاوازە لەگەڵ رومیدا، هەڵبەت ئەو حاڵەتانە زۆرن لە ئەدەبی کوردیدا.

- زۆر جــار لەشــیعرەکانتا جیهانێــك لــە عاشــقبووندا دەبینم؟ ئایا ئەمە ناگەڕێتەوە بۆئەوەی تۆ لە عەشقدا تواویتەوە، یاخود ئەوە ناگەیەنێ کە تۆ باوەڕت وایە کە هەموو شتەکان بەسەر دەچن، جگە لە عەشق هیچی تر نامینێتەوە ؟

که باسی ئەوین و ئەشقم کردووە، دەکرێ بڵێم من بەردەوام لە نێو ئەتمۆسفیری ئەویندا ژیاوم، بۆیە کە دەڵێ تۆ لەو نێوەندە تواویتەوە، ئەمە ڕاستە، بەڵام من ئافرەتم بە ئەشق و ئەوینێکی فراوان و ئەشقێکی فەلسەفی دەورەداوە ، کە هەرگیز جگە لە پەیوەست دانی ئافرەت بە بەهایەکی مەزنی خوڵقاوی نێو سرووشت، بە هیچ شێوەیەکی دیکە مامەڵەم لەگەڵدا نەکردووە، جگە لە بەهایەکی ئینسانی گەورە، بیرم لە ڕەهەندێکی دیکە نەکردۆتەوە، چونکە شیعرەکانی من بەوە ناودارن کە هەمووی بۆ تیمەی جوانیی نووسراوەن، بەڵام من باوەڕم بەوە نییە کە شیعر بۆ تۆمارکردنی جوانیی جەستە و ئەوینی سادە خوڵقا بێت، گوزارشت کردن لە ئەوین و خۆشەویستی پێویستی بە گەورەکردنی تیمەی ئافرەت هەیە، پێویستی بە رزگارکردنی ژن هەیە، پێویستی بەوە هەیە بەهای جوانی ئافرەت لە شیعردا تۆمار بکرێت وەك بەهایەکی ئینسانی، نەك گریان و لالانەوە بۆ جەستەی ئافرەت، هەموو شیعرە نەمرەکانی دونیا بەوە بوونەتە نەمر و جاوید، کە سەراپای بەهای جوانی ئافرەتیان پاراستووە، نەك وەسف کردنی جوانی، بە چمکە رووتەکەیەوە ، من تەواوی شیعرەکانم بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کردووە و پەیوەندییەکی بەهێزم بۆ شیعرەکانم خوولقاندووە لەگەڵ ئافرەتدا، دەبێ ئاستی ئافرەتیش وەك بەهای جوانی بەرز بکرێتەوە لە هونەردا، نەك وەك بەهای جەستەیی، بە شێوەیەك هەم شیعرەکە نەمر بکات، هەم ئافرەتیش،

لای شـاعیری راسـتەقینە، شـیعر پرۆسـەی دامەزرانـدنی مەملەکەتێکی جوانیی شیعرییەتە بۆ ئافرەت، نەك پاوانێك بۆ ڕنینەوەی جەستەی ئافرەت، من هەوڵ دەدەم ئافرەت بەرز و بەهادارکەم، بۆ پێگەی نەك لە پێناوی جێگەی، بزانە مەولانا رومی سەبارەت بە عەشق و خۆشەویستی چی دەڵێت: تەنها تێنووەکان واتە عاشقەکان نین، کە بە دوای ئاودا دەگەڕێن، واتە بە دوای عەشقا دەگەڕێن، بەڵکو ئیشق و ئاویش بە دوای ئەوانەوە دەگەڕێن، ئیدی لە نێو ئەم یەکیەتی بوونەی شاعیر، ئیشق خەسڵەتێکی ئەزەلییە.

**- هەر بە بۆنەی ئەم پرسیارەوە جوانیی چۆن دەبێتە پارسەنگی ژیان ، یا چۆن لە ویژدانی شاعیر پێناسە دەکرێ؟**

پرسـيارێكى بـە جێيـە و لـە شـوێنى خۆيـەتى، يـەكێ لـە شـاعيرەكانى دونيا بەداخـەوە ناچمـەوە سـەرناوەكەى، كـە مـن ئيسـتا پێموايـە ئۆدنى شـاعيرە دەڵيـت : كـە جـوانيى دەبينم دەمەوێ ببم بە دوو كەس، لاى من وەڵامێكى زۆر كورتكراوەيە بۆ جوانيى، ڕەنگە ئەگەر بيوتيايە كە جوانيى دەبينم ، دەبم بە هەزاران هەزار، هێشتا كەم بێت، جوانيى بە مليۆنان ڕەهەندى هەيە، بە تايبەت لاى شاعير، تاوەكو ئێستا لـە سيفرى درووسـت بوونـەوە هـيچ پێناسـەيەك بـۆ جـوانيى وەك بەهايـەكى ئينسـانى نەدۆزراوەتـەوە، كـە بـە تــەواوى مانــاى وشــەكەوە دارێــژرا بێــت، هــەرگيزيش دانارێژرێت، من بۆ هەمان ئەو پرسيارە نازانم لە كوێ بوو، يـا كـەى بـوو، بڵاويـش بۆتـەوە، قسـەم كـردووە بـۆ مەسـەلەكانى جـوانيى، ڕەنگـە ئێسـتا هەنـدێ شـت بڵـێم سـەبارەت بـە جـوانيى، جياواز بێت لەگـەڵ ئـەوەى كـە گوتوومـە و بڵاو بۆتـەوە، بـەڵێ بـيرم كەوتـەوە لـە كتێبـە تازەكـەى ئاورەحمـانى مـارف بـوو، دەربـارەى ئێسـتەتيك و جوانيى، شوانێ كە لەگەڵ ڕانە مەڕەكەى خۆيەتى، هەموو دونياى جـوانيى لـەوە كـورت دەكاتەوە، كە بە بلوێرەكەى پەرت و بڵاوى ڕانەكـە كۆ بكاتـەوە، خـۆ ئـەوە مەبەسـتى بلوێرەكـەى شـوانە نييـە، بـەڵكو شـوانە ڕۆحى ئاشـقانەى خۆى، كە پارچە پارچە بووە، كۆ دەكاتەوە، ڕەنگە كەسێك پێى وابێ كە يارى سێرك ئەكات، بە سەر گوريسێكى باريك، جـوانيى لەوەيـە كـە بەسـەر ئـەو گوريسـەدا ڕەت بـبێ، يـا خودى تۆ كە ئەم پرسيارە دەكەيت، لەززەتى جوانيى لەوە

دەبینیت، کە تۆ چۆن منت سەبارەت بەو پرسیارە خستۆتە ناو ئەم گێچەڵەی بیرکردنەوە، ئەمانە و هەزاران هەزار نموونەی وامان هەیە، کە هەرگیز لە کۆتایی نایەن، جوانیی وشەیەك نییە بە تەنها پەیوەست بێت بە سرووشت یا ئافرەت، لای ئەرستۆ جوانیی ئەوە بوو، کە خۆت بناسی، لای شەکسپیر جوانیی ئەوە بوو، چۆن لەو گومانە رزگارت بێت، کە هاملێتی پێ نووسی، بۆیە ناکرێ جوانیی و مەسەلەکانی جوانیی لە نێو قاوغێك قەتیس بکەین، ئەوە باشلارە کە پێی وایە جوانترین جوانیی لەوەیە، چۆن مەلێك هێلانە بۆ خۆی درووست دەکات، کروتشێ کە باس لەو منالە دەکات کە چۆن خۆی لە لیمی کووچە وەردەدات، پێی وایە پرۆسەیەکە لە بونیات نانی جوانیی، کەس پێی مومارەسە ناکرێ. جوانیی لە هەموو شوێنێکە وەیە ، لە ژێر پێمان و لە سەر سەرمان و لە نێو کراسەکانمان و لە نێوجادە و کۆڵانەکاندا، بەڵام دەبێ پەی پێ ببەین و بیدۆزینەوە. دەبینی ئەو جوانییە چ کارەساتێکە.

- ئەو شیعرەی بۆ سلێمانیت نووسی، شیعرێکی مەزن بوو، دەنگی دایەوە، هەتا لە سلێمانی وەك نامیلکەیەك چاپکراوو بڵاو کرایەوە. رەنگە کەسانێ وابزانن کە جۆرێك لە لایەنگیریی تیا بێت، تۆ رات چییە؟

ئەم شیعرە گوزارشت لەوە دەکات کە نێوەندی ژیان و گوزەران گۆڕاوە، هەموو دەوروبەر شیرینی خۆی لە دەست داوە، باری دەرونی و هەستی ناسك لە ئارادا نەماوە، بۆیە هەتا ئاشقەکانیش وەك جاران نەماون، هەموو ئەو گۆڕانە بەرەو نـاخۆشی بە هـۆی ئەوەوەیە کە ئـێمە لەم وڵاتەدا نەمـانتوانیوە سیسـتمی ژیـان رێکـبخەین و بـاروزروفێکی خـۆش درووسـت بکەیـن، هەر بـۆیەش خۆشەویسـتی و ئەشق لە مەترسیدایە، کاتێکیش کە خەڵکی بە پیرۆزییەوە سـەیری شـتە جوانـەکانیان دەکـرد، هەیـبەت و قودسـیەتیانن هەبـوو، بەڵام ئێسـتاکە خەڵـکی رێـز لە رەمزەکانی خۆیان ناگرن، کاتێکیش کە مرۆڤ رێی دەکەوێتە ملکەندی دەبینێ گەنجەکان هەمووی بەرەو مەنفا چووینە و وڵات وردە وردە لە هێزی گەنجان خاڵی دەبێت، کاتێ کە گەیشتمە توی مەلیك شیعرەکەی پیرەمێردم بیرهاتەوە کە بـۆ پەریخـانی نووسـیبوو، بەڵام ئێسـتاکە پەریخـان لەبەر نـاخۆشی ژیـان هـێزی ئەوەی نەمـاوە قژیشیـ شـانە بکات، هەموو ئەو کۆپلە شیعرانە رەنگدانەوەی تێکچوونی ژیانی تاکە لە وڵاتی ئێمەدا، من دوای نووسینی شیعری سلێمانی و تـاوەکو ئێسـتا، بیروبۆچـوونی وام نەبیسـتووە، لـە هـیچ شوێنێکیش شتی وا بڵاو نەکراوەتەوە، چونکە من دروشمم بۆ سلێمانیی نەنووسیوە، بەڵکو شیعرێکی خەمەنگیزە لە بـاروزروفی کوردسـتان بـە گشـتی، مـن بـە دیـدگاییکی ئێسـتەتیکی دژ بـە ئێسـتەتیك، باسـم لـە سـلێمانی کـردووە،وەك شـارێکی پـڕ لـە جونبوجـۆش، پەیوەنـدی بـە

هیچ لایەنێکەوە نییە و تانەوتەشەرەی تیا نییە، ئەوەکاری من بووە بە درێژایی ئەزموونی شیعریم ، من باس لە خەمگینی خۆمم کردووە لەکۆی ڕووداوەکاندا ، ئەوەیش بە شێوەیەکی ئێستەتیکی ڕوون و ئاشکرا، بە پێچەوانەوە، لە هەموو لایەکەوە دەستخۆشیم لێکراوە، ئەم شیعرە بۆ خاتری زۆنەکان نەنووسراوە، بەلکو بۆ ڕۆحی هەمیشە زیندووی مێژووی سلێمانی نووسراوە، شیعرەکانی من بە گشتی ناخزێنە ژێرباری ئەو بابەتانەوە، بە هیچ جۆرێ، من لە شیعردا دیدگای ئینسانی خۆم دادەڕێژم و شیعری ئینسانی دەنووسم، هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕستەیەکم وەك دروشم نەنووسیوە، من هەمیشە وادەکەم کە هەموو خوێنەرێ خۆیان لە ناو شیعرەکانمدا بدۆزنەوە.

**- کەواتە ناکرێ وابکەین شاعیر بە تۆری لیکدانەوە بگرین لە کێڵگەی شیعرەکانیدا ، کەواتە چۆن بتوانین لە مەبەستی شاعیر بگەین؟ نامۆ بوون دیاردەیەکی پەیوەست بەبیرکردنەوەی ئەدیب و رۆشنبیرانە، تۆ وەکو شاعیر لەمبارەیەوە چی دەڵێیت؟**

له دونیای شیعردا، ئامانجێك هەیە، ئەویش ئامانجی گەیشـتنە بـە تـرۆپکی مەسـەلەکانی مرۆڤایـەتی، ئـاواتی گەیشـتن بـە بـەدیهێنانی سرووتـێکی مرۆڤایـەتی، ئاخۆ ئـەم ئامانجـە کـە پـەی بردنـە بـە ماهییـەتی ئینسـان و کـەون و کائینـات ، چ جەدوایـەکی هەیـە کـە شـیعر و ئـەدەبیات و فەلسـەفەو رۆشـنبیریی هـەوڵی بۆ دەدەن؟ ئەمـە ئارمانێکی بوونگەراییـە، کـە هـەڵبژاردن دەکـا بـە سـەختترین مانـای وجـوودی خۆیـەوە، هەڵبـەت سەرتاسـەری ئـەدەبی بوونگـەرایی، وێڵـە بـە دوای ئـەم پرسـیارەوە، کـامۆ لـە نووسینەکەی خۆی دەربارەی مرۆڤی سەرکێش یا شاعیری یـاخی، بـە هـەزاران لێکدانـەوەی کـردووە، بـەڵام ئـاخۆ گەیشـتۆتە وەڵامی پرسـیارەکانی خـۆی، بەڵێ ڕاڤـەی زۆری کردووە، بەڵام هەرگیز ناگاتە ئەو مەبەستەی ئەو دەیەوێ، جـا تێگەیشـتن لـە مەسـتی شـاعیریش هـەر ئاوایـە، چونکـە گەر بتەوێ لەمەبەسـتی شاعیر بگەیت، بە تەواوی وەکو ئەوەیە، بە تەواوی بگەیتە مەبەستی سیفری خەڵق بوون، چما شـاعیر خـۆی دەگاتـە مەبەسـتەکانی خـۆی؟ هەڵبەت من ئەو قسانە بۆ شیعری مەزن و دەق باڵا دەکەم، وەك شیعری دانتی و شیعری ئەلیوت و شیعری نالی و جزیری، نەك بۆ ئەو ملیۆنەها شیعرەی لەسەر زەمین دەنووسرێ، دانـتی لـە سـەفەری بـۆ تەبەقـەکانی ئاسـمان، دوای مـەرگی مەعشووقەکەی، دوای چەندین ساڵ چاوی بە پەیاتریس ئەکـەوێ، زمـانی لـە گـۆ دەچێ و پـەنای بـۆ فـێرژیلی ڕێشـاندەری خـۆی ئـەبات، دەڵێ ئەوهـەموو ڕووناکییە بوو

مەبەستم؟ پەی بەوە نەبرد بوو کە مەبەستی خۆی چی بوو، هەردوو چاوەکانی خۆی دائەخات، کەواتە گەیشتن بە مەبەستی شیعری ڕۆحێکی سووتاو زەحمەتە، دەبینی من چەند بە زەحمەت باسی ئەو پرسیارە زەحمەتەت بۆ دەکەم، کە لە ڕوودا چەند ساکارەو لە قووڵاییشدا چەند پڕ مەشەقەتە؟ نامۆ بوون بۆتە دیاردەیەکی ئەم سەردەمە، کە شاعیریش تاکێکی ئەم سەردەمە پڕ لە هەراوزەنایەیە، ڕەنگە ئەوە زۆر ڕاست بێت کە شاعیرەکان زیاتر لە دەوروپشتی خۆیان تووشی وەسوەسەی نامۆ بوون دێن، نامەوێ باس لە کۆنسێپتی نامۆیی بوون بکەم، ئەمە بابەتێکی دوورودرێژە، تەنها باس دەکەم کە ئەدەب شیعر و قووڵ بیرکردنەوەی کاراکتەرانی ئەم نێوەندە، بۆچی دەکەونە نێو کەوانەی نامۆ بوونەوە، هەموو ئەو کاراکتەرانە بە بیرکردنەوە لە جیهانی دەوروبەر و کێشە فیکرییەکانەوە، تووشی داوی نامۆ بوون دێن، بەتایبەت شاعیران و چیرۆکنووسان و هزرمەندەکان کە جیاوازترین چینی بیرکردنەوەی ئەدەبی و فەلسەفین، کێشە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانن، وا دەکەن تووشی نامۆیی بن، زۆرجاران شاعیران لە نێو نیشتیمانی خۆیان تووشی ئاوارەیی و ئاوارتەی فیکری دەبن، دیارە کە ئەو هەل و مەرجەی ئەوان تیایا دەژین، بکوژی ئازادییەکانی ئەوانن، ئاخر ئەمە فەلسەفەی نامۆ بوونی شاعیرانە، نەك لە بەرگی لێکدانەوەی ئەم کەون و کائیناتە، وەك چۆن خودی فەیلەسووفەکان وادەکەن، بەڵکو لە بەرگی چنینەوەی

ئەو هەموو دەنگ و سەدایەی کە لە نادیارەوە بۆ ئێمە هەڵدەڕژێ و نایاندۆزینەوە، فەلسەفەی دۆزینەوەی یۆتۆپیایە، کوشتنی دێوەزمەی دیستۆپیایە، لە ڕێگەی ئەم تێگەیشتنەوەیە کە دەتوانین لەگەڵ شیعردا ئاشتبوونەوەیەکی ئاهەنگئامێز دروست بکەینەوە، شاعیر وەکو کەسێ وایە کەوتبێتە ناو دڵی تاریکی، لە نێو دارستانێکی چڕدا، کە تەنها بە دەرهێنانی دڵی دەتوانێ، بە نێو ئەم تاریکییەدا گوزەربکات و ئەو دڵەی وەك مەشخەڵە ئاگرێك بکات بە ئامرازی پەڕینەوە. جاکێ ئەتوانێ دڵی خۆی دەربهێنێ و بیکات بەو مەشخەڵە؟ هەڵبەت ئەوە مەحاڵی شاعیرە، چونکە شاعیر بەو دڵەوە ئەژیت، بەڵام ئەی ئەوە نییە شاعیر بەردەوام ئەو دڵەی لە نێو سینەدا هەڵئەقرچێ و ڕووناکی دەبەشێتەوە بۆ هەموو ئەوانەی لە نێو تاریکی ئەو دارستانەی مرۆڤدا دەژین؟ ئەی ئەوە دڵی شاعیر نییە بۆ هەموو ئینسانەکان دەسووتێت و لە نێو قەفەزەی سینەدا هاوار دەکات؟ ئەی دڵ دەرهێنان مانای چییە؟ هەر ئەوەیە کە شاعیر ئەنجامی دەدات، هەر ئەوەشە نامۆیی شاعیر.

**- یەکەمین پارچە شیعری خۆت کەی نووسیوەو لە کام قۆناغی ژیانت بووە و بە چ مانایێ نووسیوتە و چۆن بڵاوت کردەوە، ئێستاکە بە شیعری دەزانیت؟ یا شیعر بۆ تۆ چی دەگەیەنێ؟**

یادەوەرییەکی زۆر خۆشە، ئیمە کۆمەڵێ هاورێ بووین لە ساڵانی زوودا، بە یەکەوە سەردانی بەردەوامی کتێبخانەی گشتیمان دەکرد، کە ئەوسا لە شوێنی ئێستای لای بەرلەمان بوو، بۆ نموونە هەندێکیانم لە بیرە و ماون لە ژیاندا و هەندێکی تریان کۆچی دواییان کردووە و نەماون، وەك کەریم سۆفی کە ئێستا نووسەرو وەرگێرێکی باشەو قەرەنی جەمیل، کە یەکیکە لە گەورە هونەرمەندانی کورد و جیهانی و سلێمان خالید کە بەداخەوە نەماوە و دیزانەرێکی لێهاتوو بوو، هەروەها محەمەد وەسمان کە خاوەنی چەندین کتێبی ئەدەبی و فەلسەفییە، لە گەڵمان دابوو، ئەمە و زۆرانی تر کە ژیانی ئەو سەردەمەمان هەر لە کتێبخانەدا بەسەر دەبرد و هیچ کتێبێکی شیعری کلاسیکی کوردی نەمابوو، یەکدوو جارمان نەخوێندبێتەوە، ئیدی سەرەتای سەرهەڵدانی بیرۆکەی رۆشنبیری و ئەدەبی و هونەری بوو، لە ژیانی ئیمەدا، هەر ئەوەش وای کرد، دوای سەرنەکەوتنم لە کاری وێنەکێشاندا، کە سەرەتای دەست پێکردنی من بوو، کەوتمە سەر نووسینی شیعر، زۆر خۆم بە نووسینی شیعرەوە خەریك دەکرد، تا وای لێهات، تۆزێکی زۆر بچووك لە دونیای شیعرەوە شارەزا بم، دوای چەند ساڵێك، وای لێهات بتوانم چەند رستەیەکی شیعری بنووسم، یەکێ لەو کورتە شیعرانەی کە بۆ یەکەمین جار بوو پەرِوپۆی شیعری کردبێ، هەمان ئەو پارچە شیعرەی خوارەوە بوو کە نووسیم ، گوایە باسی چوار پارچەکە دەکەم، بە تەواوی ئەو پارچە شیعرەم لە

ناو گۆڕستانی شێخ مەلا ڕەشیدی تەیراوە نووسیوە، گۆڕستانێك بوو لە ناو ماڵاندا، ئەوكات جێی دانیشتنی برادەران بوو، با ئەوەش بڵێم ئێمە لە گۆرستاندا گەورە بووین، ئەمەش شیعرەکەیە، کە ئێستا لێی ورد دەبمەوە، بە بەراورد بۆ ئەو سەردەم زۆر ڕێك و لەبارە، هەڵبەت دوای چەند ساڵێك لەو باسانەی کە تۆمارم کردن:

**چوار پەپوولە**
**بۆ مژینی شیلەی گوڵێ کەوتنە جوولە**
**ئەوەندە دەمیان لە ناو دەمی ئەو گوڵە نا**
**پاش ئەوەی هەر پەپوولەیێ**
**بە باڵ کەوت و دەمی سڕی**
**گوڵیش بوو بە پەپوولەیێ**
**لە شەقەی باڵیدا فڕی**

کە ئێستاش ئەگەر هیوا نەبێت، پێموایە هەر بە ئاگری ئەو عەشقە، ئەم چوار پارچە بەدبەختە هەر ئەفڕێ، هەڵبەت ئەو باس و خواسە زۆری دەوێ، دەکرێ تێکرای ئەو ڕووداو و بەیەکەوە بوون و کتێبخانە و قوتابخانە، وەك ئەزموونێ لە ئەزموونەکانی ژیان و ژیانی ئەدەبیم، لە قەڵەم بدرێت و بە دوورو درێژی بینووسمەوە، هەرچەندە تۆزێکیشم لە کتێبی – بەرەو منداڵی بە جلی پاییزەوە - باسکردووە، ئەوەیش ئەگەر قەدەر مەودامان ببداتێ.

**- ئایا ڕێکەوتووە کە شیعرێکت بۆ بابەتێك یا حالەتێك نــووسی بێ و پاشـــان لــێی پەشـــیمان بووبیتـــەوە و دڕاندبێتت؟ دەکرێ باس لە یەکێ لەو حالەتانەمان بۆ باس بکەیت؟**

لـه ژیـانی هـەر شـاعیرێکدا، ئـەو حاڵەتـە روویـداوە، نەهێشتنی شیعر یا لەناوبردنی نووسینی شیعر یا دڕاندنی تێلنـووسی شـیعر، ئەوانـەش هـەر خـۆی، ئـەرموونێکن لـە ژیانی شاعیریەتیدا، من بۆ خۆم زۆرجار شیعرم نووسیوە بۆ بیرۆکەیـەك یـا بـۆ بابـەتێك، هـەمان ئـەو شـیعرەم بـەدڵ نەبووە، بۆیە لە کاتی نووسیندا لوولم داوە و فڕێم داوەتە لایەکەوە، بەڵام نەك لەبەر ئەوەی کە بابەتەکەی خراپ بووە، یا گونجاو نەبووە، بەڵکو بۆ ئەوە دەگەڕایەوە، کە من نـەمتوانیوە وەکـو شـیعرێکی بـاش دەریببڕم و دایڕێژم و مـافی تـەواوی شـیعریی پێ بـدەم، لەگـەڵ هەڵکشـانی ئەزموونی شاعیر و گەورەبوونی ئامانجی نووسینی شیعرێکی باش، یا دەقیکی ناوازە، ئەم دیاردەیە لە ژیانی نووسینی شیعری بەهێزدا، یەکجار زۆر دەبێ، کاتێك شاعیر لە نێو دونیـای کتێـب خوێندنـەوە و جـەنجاڵی ژیـان، پـەروەردە دەبێت، بە هەموو شتێك یا بە هەموو ئەو شیعرانە رازی نابێـت کـە دەیاننووسـێت، چونکـە نـەیانتوانیوە ئاوێنـەی راستەقینەی ناخ و هەست و ئەقڵ و هۆشیان بێت، بۆیە پێموایە ئەمە ساتێکی زۆر ئاساییە لە ئەزموونی شاعیرانی هـەموو جیهانـدا، شـیعری بـاش وا بـە ئاسـانی بـۆ شـاعیر دەسـتەمۆ نابێـت، مـن هەنـدێ شـیعرم نووسـیوە ، تـا ئێستاش نەمخستوونەتە ناو هیچ یەك لە دیوانەکانمدا، یا لـە کـاتی چـاپکردنی شـیعرەکانم زۆرجـار دیـزاینم هەڵوەشاندۆتەوە و شیعرم لێفڕێداون، شاعیر کائینێکی پڕ وەسوەسـە و نیگەرانییـە، لـە بـاری شـیعر نووسـیندا،

هەلبەت بۆ ئەوانەی کە خاوەنی جیهانبینی و دید و دیگای تایبەتی شیعری خۆیانن، شاعیری دڵسۆز بۆ شیعرەکانی خۆی، هەمیشە لە بارێکی ترسدا دەژیت لە کاتی نووسینی شیعرەکانیدا، ترس بە مانایە ئاساییەکەی خۆی نا، بەڵکو بەمانای ڕازی نەبوون و هەست کردن بەوەی کە لە ئاستێکدایە شایانی دەرکەوتن نییە.

- تـۆ هەسـت ناکـەی کـە لـە ڕۆژگـاری ئـازادیی و فـرە بڵاوکراوە و کۆڕو سیمینار و هاتنە کایەوەی دەنگی تازەی شـیعری، بەڵام بزووتنـەوەی شـیعر هێشـتا نـەیتوانیوە، خـۆی بـەهێز وەدەرخـات ؟ ئـەم وەسـتانە بـۆچی دەگەڕێتەوە؟

مەرج نییە زۆر بوونی بوارەکانی بڵاوکردنەوە و هەبوونی ئازادیی و بەربڵاوی کۆڕو سیمینارو چالاکییەکان، هۆیەك بـن بـۆ سـەرهەڵدانی شـیعری بـاش و پەرەسـەندنی بزووتنـەوەی شـیعری، یـا هـەر ژانـرێکی دیکـەی ئـەدەبی، نەخێر و هەرگیز، من باسی شیعر دەکەم ، شیعر لە نێو ڕەحمی فراوانبوونی دیدگا و لێکدانەوە و ئەندێشەی قووڵ و جیهـانبینی شـاعیر دێتـە کایـەوە، بـا ئـەو شـاعیرە لـە گۆشەگیریشدا بێت، کە هەمان ئەو گۆشەگیریەش باڵی شیعرەکانی بەهێز دەکات، شیعر نە پەیوەندی بە ژیانێکی خۆشەوە هەیە، نە پەیوەندی بە ژیانێکی ناخۆشەوەش، ئەمانـە کـەف کـوڵی شـیعری دەئافرێنن، کـە ناچێتـە نـاو پرۆسـەی شـیعری پاڵاوتـەوە، شـیعری بـاش مایـەی بیرکردنـەوەی قـووڵی شـاعیرە، نـەك مایـەی هـەژاری و دەوڵەمەندی، لەمێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا، هەمیشە ئەو سەرمەشـقە دەنـووسرا، کـە گوایـە فـلان شـاعیر لـە بنەماڵەیـەکی هـەژاردا بـووە، یـا هەمیشـە ئـاوارە و دەربەدەربووە، یا ژیانی لە بەندیخانەکاندا بووە، ئالەم جۆرە رستە سـواوانە، یەکجار زۆر بـوون، لـە مـەدای ڕەخنـەو ڕەخنەبازیـدا، نـا نـەخێر ئەمانـە هـیچ پەیوەنـدییێکیان بـە سەرهەڵدانی شیعری جوانەوە نییە، هەموو ئەو شاعیرە باشانەی کلاسیك بیرکرنەوەی قووڵیان هەبووە بۆ ژیان و دەوروپشـت، بۆیـە شـیعری بـەهێزیان نووسـیوە، ئـەم لێکدانەوە سۆزبەخشانە، زیانیان هەبووە بۆ بزووتنەوەی شیعری کوردی و نەیانتوانیوە بستێك شیعر بۆ پێشەوە

ڕابــدەن، شــیعر تێکەڵەیــەکی سەرســامئامێزی خــەیاڵ و ئەندێشە و بیرکردنەوەیە، نالی یا مەحوی یا دانتی یا رومی، ئەو شیعرە جوانانەیان نووسیوە، لەبەر باری هەژاری یا دەولەمەندی ؟ نەخێر، لەبەر ئەوە بووە، کە لە سەردەمی خۆیان، جیاوازبوون، بیرکردنەوەیان و هەڵس و کەوت و ڕۆشنبیریی و عەشق و خۆشەویستیان بۆ شیعر و ژیان، جیاوازی هەبووە لە گەڵ دەوروبەری خۆیان ، شارەزای ڕاستی و دروستی بوون، شیعر، لەو سەردەمەدا پارسەنگی بابەتی بووە بۆ ئەوان.

**- ئایا تۆ وەك شاعیرێ، تا چەند سوودت لە داستانەکانی کوردیی وەرگرتووە، هیچ ئەزموونێکت لەمبارەیەوە هەیە؟**

داستانەکانی خۆشەویستی و عەشق لە نێو کوولتوری کوردیدا، بابەتگەلێکی گرینگن، هەمیشە بۆتە جێی بایەخی شاعیران، بە درێژایی مێژوو، ئەو داستانانەی کوردی لە لایەن ئەدیبانەوە بایەخیان پێدراوە، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ نەتەوەکانی تردا، دیارە کە ئێمە کەمترخەمین سەبارەت بە خزمەت کردن و چاپکردن و لێکۆڵینەوەکان بۆ ئەم داستانە جوانانە، لە شوێنان بە جوانترین چاپ و باشترین لێکۆڵینەوەی مێژوویی، خزمەتی ئەو داستانانەیان کردووە، چونکە ئەو داستانانە بنەمای بیرکردنەوەن و سەرەتایەکی گرینگی ئەقلی سەرەتایە، زۆر لە شاعیرانی دونیا بایەخیان بەو جۆرە داستانانە داوە و سوودیان لێوەرگرتوون، هەروەها زۆر لە شاعیرانی کوردیش، داستان و ئەفسانە دوو بابەتی گرینگن بۆ ئەو مێژوونووسانەی لە مێژووی کورد دەکۆڵنەوە، منیش لە سەرەتای نووسینی شیعرەکانمدا، لە هەندێ شوێن وەك سیمبۆل و دەمامك بەکارم هێناون، بەڵام من سێ دەقی شیعریم نووسیوە، کە بەشێوەی شانۆگەری شیعری دامرشتوون، لەوانە **ئەفسانەی زەرییە سەر شێتەکان و ئاسیە خان و سوارانی بەفر**، کە سێ شانۆگەریی ئیستعرازین، سوودم لەو داستانانە وەرگرتووە.

- چەند رازیت لەو وەرگێڕانانەی کە بۆ شیعرەکانت کراون، ئایا خوێنەریان هەیە، یاخود لێکۆڵینەوەیان بەدوادا هاتووە؟

وەرگێڕانی شیعر سەختە، بەڵام وەك دەڵێن – شر لابد منه - ئەگەر کاری وەرگێڕان نەبێت، ئەی چۆن لە داهێنانەکانی دونیا بگەین؟ بۆیە وەرگێڕان بەو مانایە زەرورەتە، شیعرەکانی من زۆریان وەرگێردراون، بۆ زمانێکی دیکەی وەك عەرەبی و ئینگلیزی و فارسی ئیتالی و هەروەها سویدی، من ناتوانم وەڵامی ئەوەت بدەمەوە ئاخۆ خوێنەریان هەیە یاخود نا، هەروەها لێکۆڵینەوەشم نەبینیوە، بەڵام لیرە و لەوێ هەندێجار چەند شیعرێك وەرگیراوەو قسەی لەمەڕدا کراوە، هەلبەت خوێنەر هەر هەیە و لیکۆڵینەوەش هەیە، من نازانم کام نووسەر یا شاعیر قسەی لەسەر ئەو شیعرانەم کردووە، لە زمانی ئینگلیزی یا فارسی، بەڵام دەزانم لە سویدی دوو شاعیری گرینگ شتیان نووسیوە، بەهەر حال وەرگێڕانی بەرهەمەکانمان کارێکی زۆرباشە، بەڵام ئەوە دەبێت بە پڕۆژە بێت، بە یەکدوو شیعر لەملاو ئەملادا سوودێکی نابێت، بۆ ئەم مەبەست دەبێ دەولەت کار بکات، ئەو نووسەرانەی کە شیعرەکانی منیان وەرگێڕاوە بۆ زمانێکی دیو دیارن وەك رزگار شیخانی و محەمەدی مەلا حوسین و نیهاد نەجارو شۆڕش عەزیز سورمێ و بابەکی سەحرانەوەرد و جەمال غەمبار و میهردادی رامیدی نیا و دکتۆر سەعدی مالح و کەسانی تریش.

**- سـەرنجم داوە بـەردەوام خـەریکی خویندنـەوەی، ئایا شیعری هاوڕێکانت دەخوێنیتەوە، ئایا بەسـەر کامیانەوە هەڵوەستەت کردووە؟**

هیچ داهینانێکی مرۆڤایەتی و هیچ تێکستێکی ئەدەبی و مەعریفی، بەبێ خوێندنەوە نایەتە کایەوە، ئەگەر بێتە کایەوەش، هەڵگری هیچ جۆرە شوناسێکی مانەوە نابێت، من هەر لەسەرەتاوە خوێندنەوە گەورەی کردووم و شیری ژیانی پێ بەخشیوم، لە نەهامەتییەکان دەوری داوم، خوێندنەوەی کتێب هەموو وەحشەتێکی ناخی ئینسان دەکوژێ، هەموو رەشاتییەك لە دەڵی مرۆڤ دەسڕێتەوە و غەرقی سپیپاتی دەکات، خوێندنەوەی کتێب، رقوقین دەشواتەوەو سینەی مرۆڤ پڕ لە خۆشەویستی ئەکات، ئەی ئەمە گەورەترین و کاریگەرترین چەك نییە؟ خوێندنەوە لەو چەکە سپییانەیە کە مرۆڤایەتی پاك دەکاتەوە، هەربۆیەش من خوێندنەوەم کردووە بە پیشەی ژیانم، تۆ تاقی بکەوە کە کتێبێك دەخوێنیتەوە، ئەم شادی و خۆشییە چییە بە گیانتا دادێت و ئاسوودەت دەکات، پاشان من کار لە ناو شیعر دەکەم، کە پێویستی بە هاوڕێیەکی ئاوەهایە، ئەگەر میللەتەکەی ئێمە کتێبیان لا پیرۆز بووایە، ڕۆڵەکانی خەریکی خوێندنەوە بووان، بۆ ئێمە هەزار ساڵە ژێردەستە دەبووین؟ بۆ وەها پەرتەوازەو بێ ئامانج دەبووین؟ خۆ ئەگەر سەد ساڵە بە کتێب شەڕمان کردبایە، ئێستە ئاڵای کتێبی ئازادی، لەسەر هەموو ماڵەکاندا دەشەکایەوە. سەبارەت بە بەشی دووەمی پرسیارەکەت ، بەڵێ من عاشقی خوێندنەوەی هاوڕێکانم، لە شاعیران، هاوڕێ کۆنەکانم بن یا شاعیرانی گەنج بن، بە

هەندێکیان سەرسام دەبم و هەڵوەستەیان لەسەر دەکەم، لێت ناشارمەوە هەندێکیشیان نائومێدم دەکەن.

- بیرت لەوە کردۆتەوە کە شتێ لەمەڕ شیعری هاوڕێکانت بنووسی، ئەگەر ویستت کارێکی وابکەی، کامیان هەڵدەبژێری؟

کاری نووسین بە ویست و داخوازیی نییە، بەڵکو بانگی ماناکانە، کە لە قووڵاییی بیرکردنەوتدا بانگت دەکەن، ناچارت دەکەن کە بنووسی، واتە نووسین لەخۆیەوە نایەتە کایەوە، بەڵکو پێداویستی ڕۆحی و مەعریفییە، داوات لێدەکات بنووسی ، بۆ نا، زۆر ئاساییە ڕۆژێ لە ڕۆژان، ماناکان بانگم بکەن و ناچارم کەن، کە لەبارەیانەوە بنووسم، هەڵبژاردن لە ئارادا نییە و ماناکان تۆ هەڵدەبژێرن، بەڕاستیش زۆر جاران نووسین لە مەڕ ئەوانیدیکە تووشی جۆرێك لە گرفتی دەروونی و دابڕان لەویدیت دەکات، کۆمەڵگەی ئێمە هێشتا زۆری ماوە بگات بە ئاستی ئەو گیانە ریازییەی کە قەبووڵی ڕەخنە بکات، ئاخر ڕەخنەو گوتاری ڕەخنەیی، یەکێ لە دیاردە هەرە پێشکەوتووەکانی شارستانییەتە، گوزارشت لە بوونی دیموکراسییەت دەکات، هەر بۆیەشە هەتا لە ئاستی سیاسیشدا، کێشەی گەلەکەمان بستێ نەچۆتە پێشەوە، بەرەو بونیاتنانی ژێرخانێکی گرینگی مەعریفی و ئابووری و کۆمەڵایەتیدا، ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە گیانی قبوڵکردنی ڕەخنەو قبووڵکردنی یەکمان نییە، جا من کە لە مەڕ شیعرەکانی هاوڕێیەکم یا دۆستێکم بنووسم، کە کۆتایی بە لالووتی دابڕان بێت، کەواتە هێشتا ماومانە.

- خوێنەری ئێستا زیاتر لە شیعر خۆی بە خوێندنەوەی ڕۆمان و بیرەوەری خەریك كردووە، ئایا ئەمە بۆ ئەوە ناگەڕێتەوە ، کەشیعری تازە لەززەتی شیعری کلاسیکی نەماوە؟

نـازانم  مـن هەڵـەم یـا نـا ، کـە کـەم کـەس دەبیـنم بخوینێتـەوە، واتـە ئەوانـەی کـە دەخوێننـەوە لـە لای مـن دەستەبژێرن. ئـەوانی تـر هێنـد کـەمن دیـار نـین، پرۆسـەی خویندنەوە لە کوردستاندا وەکو ئەوەی من دەیبینم ، هەر ئەگەر لـە سـەدا دوازدە یـا سێزدە کـەس بێـت، ئەوەشـیان رێژەیێکی زۆر کەمە، بە بەراورد لەگەڵ زۆری کتێب، ئەوەی تۆش دەڵێیت کە خوێنەرانی ئێستا زیاتر رۆمان و کتێبەکانی بیرەوەری دەخوێننەوە، نەك کتێبە شیعرییەکان، خۆ ئەگەر وابێـت خوێنـەری ئـەو ژانـرە ئەدەبیانـەمان هـەبێت، ئـەوە موژدەیەکی زۆر خۆشە، بەڵام من وای نابینم، خۆ ئەگەر پێشـــکەوتنی تـــەکنولۆژیاو پەرەســـەندنی میـــدیا ئەلیکترۆنییەکان، هێندە خێرا بن و مەودا بە مرۆڤ نەدەن وەك دەڵێن، ئێ کەواتە زیاتر سەردەمی لەناوچوونی رۆمانە و کـە کاتێکی زۆری دەویێ بـۆ خوێندنـەوە، نـەك شـیعر، کـە کـاتێکی کـورتتری دەوێـت بـۆ خوێندنـەوە، ئەگـەر بـەراورد بکەین لەگەڵ ساڵانی پێشتر، واتـە حـەفتاکان و هەشتاکان، خوێنـەر ئـەوکات زیـاتر بـوو لـە ئێسـتاکە، کـە دەبوایـە بـە پێچەوانـە بێـت، ئەگـەر پـەیامی سـاڵانەی یۆنیسـکۆمان لەبەردەســت بێــت، ئــەوە بۆمــان روون دەبیتــەوە کــە خوێندنـەوە بـەرەو لاوازی دەچێـت، لـە زۆربـەی وڵاتـانی دونیادا، جگە لـە هەنـدێ وڵات نـەبێت، بەڵام لـە وڵاتێکی وەکـو ئەسـپانیا لەیـەك سـاڵدا بەقـەد هـەموو وڵاتـە عەرەبییـەکان کتێـب چـاپ دەکرێـت، خـۆ ئـەوە دیـارە کـە رێـژەی خوێنەرانیشی دەبێ زۆربێـت، بـەڵام لـە کوردسـتانی

، راپەڕینـدا، چـاپ کـردنی کتێـب بـە لێشـاوە، بـەڵام
نەر زۆر دەگمەنە ، جاران ئەگەر هەزاردانە چاپکرابا،
ی نەدەمایەوە، بەڵام ئێستا تیراژی کەم کتێب هەیە لە
د دانـە هـەتا ٥ سـەد دانـە زیـاتر بێ، لەگـەڵ ئەوەشـدا
ێنێتـەوە، هەلبـەت ئەوەشـیان هۆکـاری زۆری هەیـە،
ڕێ باسیان بکەین. بەڵام نەمانی لەززەتی شیعری وەك
ززەتی شـیعری کلاسـیك، ڕەنگـە ئەمـەش یـەك لـە
کارەکان بێت.

**- ئێستا کۆمەڵە گەنجێك شیعر دەنووسن و بڵاوی دەکەنەوە، تێڕوانینت چییە بۆ دەسپێکی گەنجەکان، هیچیان سەرنجیان ڕاکێشاوی؟**

من بە بەردەوامی شیعری گەنجان دەخوێنمەوە، لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان، ئەوانەی دەستم دەکەوێ، هەروەها دیوانی شیعرەکانیشیان، کە جار جارە پێشکەشم دەکەن، لە گەڵ گەنجانیش دادەنیشم، گفت و گۆو قسە و باسیشمان هەیە، ئێمە نابێ خۆمان بە دوور بگرین لەو گەنجانەی کە خەریکی شیعرن و خۆمان بە گەورەتر بزانین لەوان، چونکە رازی بین یا رازی نەبین، هەر ئەوانن، داهاتووی ئێمە، لە ناو ئەدەبیات دا، ئێمەش سەردەمێك گەنج بووین، هەر چاوەڕوانی ئەوەمان دەکرد، کە ئەوانی بەر لە ئێمە، بایەخیان بە ئێمە بدابا، خۆ تەریك کردن لەو گەنجانە، خۆ تەریك کردنە لە داهاتووی شیعری کوردی، هەڵبەت خۆ ناتوانم بڵێم هەموو شیعرەکانیان خراپن و لە ئاستێکی نزمدان،هەروش ناتوانم بڵێم هەموو شیعرەکانیان باشن، بەڵام بە گشتی هەندێکیان سەرەتایەکی باشیان بۆخۆیان دارشتووەو شیعری باشیان هەیە، زۆرجار هەندێ لە شیعری ئەو گەنجانە دەخوێنمەوە، لێت ناشارمەوە کە زۆر زۆر سەرسام دەبم، بەوەی کە بیرۆکەی جوان و زمانێکی پوختەو دارشتنێکی جوانیان هەیە، ئەمە بۆ من مایەی دڵخۆشییە، هەندێ شیعرم لە هی گەنجان خوێندۆتەوە لە هەولێر و سلێمانی و ئەملاو ئیملا، یەکسەر تەلەفۆنم بۆ کردوون و پیرۆزبایی گەرمی خۆمم پێشکەش کردوون، هەندێ لەو گەنجانە کە لە گەڵیانا دادەنیشم، هەست دەکەم خزمەتی خۆیان کردووە و رۆشنبیرییەکی باشیان بۆ خۆیان پەیداکردووە و باشیش

دەخوێننەوە، ئەمەیان بۆ من جێگەی خۆشحاڵیە، ئەوەی لێرەدا دەمەوێ بیڵێم ئەوەیە، کە هەوڵدان بۆ زمانێکی پوختە و بێ گرێو گۆڵ، هەروەها پەلە نەکردن و زوو مەغروور نەبوون، خوێندنەوەی بەردەوام، زۆر گرینگن بۆ گەنج، ئاسۆی شیعریان پڕ درەوشانەوە دەکەن، جیهانی شیعریان بۆ دەکریتەوە و لە ماهیەت و نهێنی شیعر، نزیکیان دەکەنەوە، دواجار خۆیان لە شوێنە پڕ شەوقەکەی شیعردا دەدۆزنەوە، من هیوام پیتانە گەنجەکان.

- لـه سـەردەمی حەفتاکانـدا ژمارەیـەك شـاعیر دەنـگ و ڕەنگیـان هـەبوو، ببـوون بـە ناسـنامە شـیعرێی کـوردی، وەك ئـەنوەر قـادر جـاف و فـەرهاد شـاکەلی و سـەلاح شـوان و عەبـدولا عـەباس، ئایـا تـاوەکو ئێسـتاش بەردەوامن؟

ئەوانە ناوی گەورە بوون لە نێو ڕەوتی شیعری کوردیدا، بەشدارییکی باشیان هەبووە، لە پەرەپێدانی تازەگەریی لە نێو ئەدەبیاتی کوردا، لەم ڕێگەیەوە بەرهەمی باشیشیان پێشکەش بە خوێنەران کردووە، ئێستاش بەردەوامن لە کاری ئەدەبیی و ڕۆشنبیریی خۆیان، بەڵام دوای ئەو هەموو ساڵە، هەڵبەت گۆڕانێ لە جۆرو شێوەی بەرهەمەکانیان ڕوو دەدات، من پیموایە ئەوانە تا ئێستاش بەردەوامن، لە شیعر و هەندێکیان دیوانی تازەشیان هەیە، بە تایبەت فەرهاد شاکەلی، ، سەلام موحەمەد، بەردەوام شیعر بڵاو دەکاتەوە، هەرواش عەبدولا عەباس، کە بەڕاستی سەردەستەی نوێکاری بوو لە شیعردا، من هەندێ شیعری ئەم دواییەی سەلاح شوانم خوێندۆتەوە، تازەن و زۆر جوانن، ئەگەر هەندێ دیوانی شیعری فەرها شاکەلی دوای دیوانی پڕۆژەی کۆدێتایەکی نهێنی بخوێنیتەوە، هەست دەکەی کە چەند بە عەشقەوە ئەم دیوانە شیعرییە تازانەی نووسیوە و چۆن لە نێو جۆرێک لە تەصەووفدا بینای شیعری خۆی کردووە، چەند بایەخ بە زمان دەدات، لەبەر ئەوە دەتوانم بڵێم کە هێشتا بەردەوامن و کاری گەورە گەورەشیان لە ئەستۆ گرتووە، بەڵام کاتی خۆی شیعرە جوانەکانی ئەنوەر قادر جافم خوێندۆتەوە، تا ئێستا دیوانی تازەییم نەبینیوە، ئەو ڕەنگە خەریکی کاری تیوری بێت، بە تایبەتی لەمەڕمەولەوی و شیعری کلاسیکدا، کە ئەوەش درێژە پیدانی شیعرە.

- لـــه كۆتـــایی حەفتاكانـــدا كەســـانێك بـــاسی شـــیعری كۆنكریتییان دەكرد، ئەمەیان چۆن بوو؟

سەرهەڵدانی ئەم جۆرە دیاردانە هەبووە، بیرم دێ لە کوردستان شیعری ئەلیکترۆنی و کۆنکرێتی باس دەکران، بەڵام ئەمجۆرە دیاردانە هەر زوو، خامۆش دەبوونەوە و دەنگیان نەدەما، زۆر سرووشتیشە کە ئەو جۆرە رێبازانە سەر هەڵبدەن، دونیای شیعر هەموو ئەوانە هەرس دەکات، گرینگ ئەوەیە دواجار چی دەمێنیتەوە، پانتایی شیعر زۆر فراوانە جێگەی هەمووان دەبێتەوە و هەموو دیاردەکان لە باوەش دەگرێت، دەتوانم باسی چەمکی کۆنکریتیت بۆ بکەم، بەڵام ناتوانم باسی شیعری کۆنکریتیت بۆ بکەم، تێرمی کۆنکریتی زیاتر لە بواری سیاسی و زانستی و موعادەلاتی بەکاردێت، وەك ئەوەی بلێی من بەڵگەی کۆنکریتیم هەیە، یا ئەمە مەسەلەیەکی زانستییە و کۆنکریتییە ڕەت ناکرێتەوە، بە هەر حاڵ لەناو ئەدەبی کوردیدا، هەموو شتیك هەیە، ساڵانێك گرووپێك پەیدا بوون کە ناویان گرووپی زناك و گرووپی هەڵم و گرووپی سەراب بوو لە شیعردا، یا گرووپی فۆرمی گران، یا شیعری زیپ، هەروەها گرووپی پێشڕەو، هەتا دوایی و ئەوانە ریێیان تێ دەچێ و دەکرێ تۆوی شیعر

لە خاکەکەیان شین بێت ، بۆ نموونە ئێستا باو باوی شیعری هایکۆیە، بەڵام ئەو تەرزە شیعرە سەدەیەکی زیاتر بەسەردا تێپەڕیوە، لە چین و یاباندا، بەڵام شیعری کۆنکریتی ناخێوێتە ناو بنەمای شیعر، ڕەنگە من هەڵە بم.

- وەك شاعیرێ چۆن بیر لە ئەدەبی ژنان دەکەیتەوە، ئایا ژنانی کورد لە چ ئاستیکی شیعری دان؟

لە ڕاستیدا من باوەڕم بەوە نییە، ئەدەبێك هەبێت، بەناوی ئەدەبی ژنان یا ئەدەبی پیاوان، ئەمە بیروبۆچوونێکی زۆر کلاسیکییە، یاخود زۆر کۆنینەیە، کە پرۆسەی ڕەخنە درووستی کردووە، ئەدەب لە نێو قاوغی جێندەریدا کار ناکات، بەڵکو لە دایکبووی بیرکردنەوەی مرۆڤدایە، جا چ ژن بێت یا پیاو، بەڵام دەتوانی پرسیارەکە بەمجۆرە بێت، ئاخۆ لە کوردستان ئەو ئافرەتانەی شیعر دەنووسن، ئاستی بیرکردنەوەیان سەبارەت بە شیعرو پرۆسەی نووسینی شیعر لە کوێی بزووتنەوەی تازەی شیعریدایە؟ توانیویانە ئەدەبێکی شیعری توندوتۆڵ بخەنە ئاراوە؟ یا ئەو دەقانەی کە دەینووسن لە ئاستی شیعرێکی باشدان؟ هەڵبەت ئەمڕۆ لە کوردستاندا، ژنگەلێکی زۆر خەریکی شیعر نووسینن، کە من شانازییان پێوە دەکەم، وەك چۆن لە نێو پیاوانیشدا کەسانێکی زۆر خەریکی نووسینی شیعرن، نامەوێ ناوی کەسێك بهێنم من بە گشتی قسەدەکەم و دەڵێم بەداخەوە لەنێو هەردوو ڕەگەزداو بڕی خراپ لە نێو شیعرەکاندا زۆرترە لە بڕی چاك، واتە دەقی خراپ هێجگار زۆرە، هەندێ ئافرەتمان هەیە ئەدەبێکی شیعری جوانیان ئیزافە کردۆتە سەر خەرمانەی ئەدەبی کوردی، دەقەکانیان لە ئاستێکی بەرزدایە و هەندێکیشیان نەیانتوانیوە، لە ئاستی قورسایی شیعر دابن، ئەوەشیان دەگەڕێتەوە بۆ ئاستی خراپی خویندنەوەیان، کە وادەکات زەخیرەیەکی باشی فیکری و مەعریفیان پێ نەبێت ، تا لە شیعر نووسیندا سوودی لێ وەرگرن، هەر ئەوەشە کە شاعیری

باش دەگمەنە لە نێو ژنانی یا ئافرەتانی کورد، هەن بەشدارییەکی گرینگ دەکەن لە پرۆسەی تازە کردنەوەی شیعری کوردی، من وای دەبینم رەنگە کەسانی تر بیروڕای تریان هەبێت.

**- پەیوەندی شاعیرانی کورد بە تەکنولۆژیای میدیاوە تا چەند کاریگەر بووە بەسەر نووسینەکانیانەوە یا بۆ راپەڕاندنی ارەکانیان لەم بوارەدا؟**

ئەدیی کورد بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بێبەش بووە لە ئامێرە تەکنولۆژییەکان، یا لە تەکنیکی ئامێرەکانی بواری نووسین و میدیای ئەلیکترۆنی، ئەگەر ڕاستیت دەوێت ئەوە دوای ڕاپەڕین بوو، کە ئابلۆقەکانی سیاسی و ئیداری و ئابووری هەڵگیران، ئیدی کۆگاکان پڕبوون لەم چەشنە تازەیەی بواری تەکنۆلۆژی، لە مەودای کاری رۆژنامەگەری و نووسین بە کومپیتەرو دیزاین کردندا، ئەمەش کاریگەرییەکی زۆری کردە سەر پرۆسەی نووسین، جاران تا بەرهەمێکی شیعریت ئامادە دەکردو چەندین جاروجار دووبارەی نووسینت دەکردەوە و یا ئەگەر رۆمانێکت بنووسیایە دەبوایە چەندین جار بە دەست پاکنووس و دووبارە دارشتنەوەت ئەنجامدایە، بەڵام ئەو ئامێرانە کاری نووسینەوەیان زۆر ئاسان کردووە، بەڵام نابنە هۆی ئەوەی داهێنانت بۆ فەراهەم بکەن، بەڵام هەندێك لەبەر نەبوونی ئەزموون، تاوەکو ئێستاش نەیانتوانیوە، سوود لەم پێشکەوتنە ببینن، تا ئێستاش هەر بە دەست دەنووسن، کە بەڕاستی زۆر پیویستە فێری بین.

**- ئایا شیعری نوێی کوردی توانیویەتی شوناسی خۆی لە ناو پێگەی ژانرەکانی دیکەی ئەدەبی کوردیدا بسەلمێنێ، وەك ژانرێکی بەهێزی بزووتنەوەی بیرکرنەوەی تاکی شاعیر لە نێو کۆمەڵگەی کوردەواریدا؟**

هەر بە هەمان ڕیتمی پرسیارەکەی تۆ، دەکرێ بڵێین ئایا شــیعری کــوردی تــازە توانیویــەتی وەك بزووتنەوەیــەکی ئێستەتیکی و ویژدانی، بوونی خۆی لە نێو کۆی بزوتنەوەی کوولتـووری بسـەلمێنێ و پشـت ئەسـتوور بێـت، بـە دەقی نـاوازە و دەقی پتـەوی خـۆی؟ کـە هـەلگری پێکهاتەیـەکی زمانیی و مەعریفی و ئێستەتیکی بێت، بە بەراورد لە گەڵ بزووتنــەوەکانی دیکــەی مــەدای شــیعری نــوێی کــوردیی قۆناغەکانی پێش خۆیدا، ئەگەرچی هەر لە سەردەمی گۆران و شێخ نووری شیخ صالح، ئەو بزووتنەوەیە، خۆی ئاشکرا کرد و وێرای کۆمەلیك شاعیری دیکە لە هەولیرو سلێمانی و کـەرکوك، توانییـان ڕەوتـێکی تـازە لـە شـیعری کوردیـدا بخەنە ناو پرۆسەی پەرەسەندنی شیعریی و قۆناخیك بۆ خۆیان و سەردەمی خۆیان درووست بکەن، کە خەسڵەتی تایبـەتی خۆیـان هـەبێت و هـەلگری شوناسـێکی دیـاریی شــیعری کــوردی بــن، بــەڵێ ئــەوان توانییــان خۆیــان بســەلمێنن، لـە ڕێگـەی بەرهـەم هێنـانی دەق بـە هـێزی شــیعری و تیـوریزە کـردنی گوتـاری ڕەخنــەیی و دیـالۆگی بەردەوام ، کە لە پاش ئەوانیش قۆناغێکی دیکەی جیاواز دەستی پێکـرد، کـە پەرەسـەندنی بـاری ڕۆشـنبیریی کـوردی چووبـووە پێشـەوە، بزووتنـەوەی ڕوانگـە ڕێبەرایـەتی ئـەو تازەگەرییـەی دەکـرد، بەرنامـەو گوتـاری خۆیـان هـەبووە، شیعری کوردییان لە قۆناغی کلاسیك و قۆناغی گۆڕانەوەو بــردە قۆنــاغێکی دیکــە، ئــەوان ســەر بــە خوێندنــەوەی بــەردەوام و دیــالۆگی بــەردەوام و زۆربــوونی چاپخانــە و

چاپکردنی کتێب بوون، دوایش قۆناغی هەشتاکان هاتە کایەوە، لە ژێر ناوی جیاجیاوە، کە هێندەی دیکە ڕەوتی شیعری کوردییان بەرەو پێشەوە برد، ئەمانە هەمووی وامان لیدەکەن بلێین، بەڵێ شیعری نوێ و تازەی کوردی، سەلماندوویەتی کە زیندوێتی تیایە و پشت ئەستوورە بە بەرهەمگەلێکی باش، ئێستاکە خاوەنی شوناسی خۆیەتی، لە گەڵ ڕەوتی گۆڕانی دونیادا دەڕوات.

- حەز دەکەم بزانم، لە دەمی تۆوە، کە جیاوازی چییە لە نێوان شیعری نوێ یا شیعری تازە یا شیعری سەردەم، ئایا ئەم دەستەواژانە، هەریەکە و پێناسەی خۆی هەیە؟ ئەی چۆن مانای شیعری لە روانگەی خوێندنەوە دەست نیشان دەکرێ؟ یا خۆت چۆن مانا یەکلایی دەکەیتەوە؟

ئەمانە هەمووی دەسەڵاتی ڕەخنە درووستی کردوون، ئەوە گوتاری ڕەخنەیە، ئەم تێرم و دەستەواژانە ئەخاتە نێو بزووتنەوەی شیعرو ژانرەکانی دیکە، وشەی نوێ یا وشەی تازە یا وشەی سەردەم، لە ناوەرۆکدا هەڵگری جیاوازبوونە، لەگەڵ شتەکانی بەر لە خۆیان، هەموویان دەچنەوە ناو یەك قاوغی فراوانی گۆڕان، لە ڕەوتێك بۆ ڕەوتێکی دیکە، بەیەکەوە لە جووڵە دان، لە بنەڕەتدا هەمان ئەم دەستەواژانە یا ئەم تێرمانە، مانایەکی سەرەکی دەبەخشنە بزووتنەوەی شیعریی کوردی، کە هەوڵدانە بۆبەرهەمهێنانی جۆریك لە شیعریی جیاواز، کە هەڵگری سیماو خەسڵەتی گۆڕان و جیاوازی بێت، زیاتر دەچنەوە سەر بۆچوونێکی ڕۆلان بارتی، سەبارەت بە چەمکی جیاوازی، شوناسی خۆیان دەبەخشن، موژدەی لە دایکبوونی پرۆسەیەکی شارستانین، هەوڵی خولقاندنی جووڵەیەکی جیاوازو گۆڕاو دەدەن، بە تایبەت لە گەڵ قۆناغی بەر لە خۆیان. هەموو شیعرێك مانای تایبەتی خۆی هەیە، زەمەنی ئەوە بەسەرچووە، کە مانای شیعر لە دڵی شاعیردایەو بەس، ئێستێکە مانا لە دەست شاعیر چۆتە دەرەوە، لە هەموو دڵێکدا بوونی هەیە، پێشتر تەنها شاعیر لە مەیدانەکە بووە و ئێستاکە خوێنەری شاعیر و ڕامانگیر درووست بووە، کە لە ئەنجامی پەرەسەندنی بوارەکانی مەعریفی سەریان هەڵداوە، بە تایبەت کە شیعر لەمڕۆکەدا، هەڵگری ماناو چەمکی سەردەمیانەیە، کە هەمووی پەیوەستە بە هێزی شاعیر و مەعریفەی ئەدەبی

شاعیر و مەعریفی بەدەست هاتووی خوێنەرەوە، شاعیر
کە شیعر ئەنووسی و دایئەڕێژێ بۆ بەردەستی خوێنەر
ئەڕوا، خوێنەریش خاوەنی دیدو دیدگای خۆیەتی،
پەیوەست نییە بە لێکدانەوەی ئەو مانایەی کە شاعیر
مەبەستییەتی، ئەو دونیای خۆی هەیە، لە ناو ئاسۆی
دەقەکانی شاعیردا، مانا لە شاعیرەوە بۆ خوێنەر دەگۆڕێ،
چونکە خوێنەر بە دیدێکی ڕەخنەگرانە شیعرەکە بۆ خۆی
هەڵدەوەشێنێتەوە و تەواو وەك ئەو فەلسەفە تیورییەی
رۆلان بارت قسەی لە بارەیەوە دەکات، دەق بە هەموو
ڕستەو ماناو ناوەرۆکەوە لە دەست شاعیر دەچێتە دەرەوە،
واتە مردنی خۆی لەگەڵ تەواو بوونی شیعرەکە
رادەگەیەنێ، هەربۆیەش خوێنەر پێویستی زۆری هەیە بە
ڕۆشنبیریی بۆ خۆی، بە تایبەت کە شیعریی کوردی
لەمڕۆکەدا پڕە لە سیمبۆل و میتافۆر و خوازەو ڕەوانبێژی.

**- بـۆ شـیعری نـوێ سـەریهەڵدا، ئایا کلاسـیک هـێزی سـەردەمی نـەماوە، یا هۆیـەکانی چی بـوون، ئایا تـاوەکو ئێسـتە، لـە روانگـەی تـۆوە باشـترین کتێب کامەیە کـە باسی لە شیعری نوێی کوردی کردبێت، تۆ کامیانت بە دڵە؟**

ئەمە سەیروورەتی ژیانە، کە هەمیشە لە گۆڕاندایە، گۆڕان تاکە خەسڵەتی ژیانە، کە هەمیشەو ئەزەلییە، زیاتر لە دوو هەزار ساڵە هیراکلیتس وتوویەتی کە گۆڕان خەسڵەتی بوونی مرۆڤایەتییە، هەمان ئەو گۆڕانەش هەمیشە کۆمەڵێ چەمك و بابەتی تازە و نوێی لە هەناوی خۆیدا شاردۆتەوە، سەرهەڵدانی شیعری نوێش یەك لەو دەرەنجامانەی ئەم گۆڕانەیە، بەڵام سەرهەڵدانی شیعری نوێی کوردی و هەموو سەرهەڵدانەکان بەو مانایە نین، کە هەموو ئەو شیعرانەی پێش خۆیان توور هەڵدەن، بەڵکو شیعری نوێی کوردی درێژبوونەوەیە، بەسەر شیعری کلاسیکی کوردیدا، بە شێوە و ناوەرۆکی تازەوە، واتە کە شیعری نوێ سەری هەڵدا دەستووری کلاسیکی لەدوای خۆی جێهێشت و بە دەستوورێکی تازەوە خۆی دارشتەووە، هەلبەتە ئەوەشیان هەمان ئەو دەرەنجامانەیە، کە گۆڕان دەیخوڵقێنێ، دەنا لە ڕاستیدا هیچ دەقێکی شیعری گەورەو مەزن، بە ڕابردنی زەمەن کۆتایی نایەت، جا کلاسیك بێت یا تازە، چونکە شیعری نەمر، هۆیەکانی مانەوەی بە جاویدانەگی لە هەناوی خۆیا هەلگرتووە و زەمەن پێیناوێرێت. بە درێژایی ساڵانی دوای حەفتاوە، کتێبی زۆر دەربارەی شیعر نووسراوەو تیوریزە کراوە، گوتارێکی زۆر دەربارەی شیعری تازە نووسراوە، هەروەها گوتاری رەخنەییمان هەیەو دیالۆگ و دیمانەی زۆرمان هەیە، بەڵام سەرەتای گوتاری رەخنە سەبارەت بە شیعری نوێی کوردی لە دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسوڵەوە

دەستی پێکردو چەکەرەی کرد، کاتێك شیعری کۆمەڵێك شاعیری تازەی خستە بەر ڕەخنەو لێکۆڵینەوە، جگە لەمەش پاشان ڕەوتێکی گرینگی ڕەخنەی تازە، لە لایەن گەنجە ڕۆشنبیرەکانەوە، هاتە ئاراوە، کە جیاواز بوو لەگەڵ گوتارە ڕەخنەییەکانی پێشوو، دەربارەی شیعری تازەی کوردییەوە، هەندێ لەم گەنجانە توانییان گوتارەکانی خۆیان بە کتێب بڵاو بکەنەوە، دەکرێ لە کۆی ئەم گوتارانەوە، کتێبی باش سەبارەت بە شیعری نوێی کوردی بێتەکایەوە.

- مەسەلەی دیقەتکردن و لێوردبوونەوە، لای هەندێ شاعیری عەرەب وەك ئەدۆنیس و ماغوت و مەحمود دەروێش، ئاشکرایە، هەست ناکەی شیعر لای هەندێ شاعیری کورد، ئەم بایەخەی کەمتر لا بەرچاو دەکەوێ، واتە لە کاتی نووسینی شیعردا، دیقەت و لێوردبوونەوە کەمە؟

له بنەڕەتدا مانای شیعر دیقەت و لێوردبوونەوەیە، بەبێ ئەم بایەخە شیعر جیاوازی نامێنێ لەگەڵ قسەی ڕۆژانە، ئێمە سێ جۆر ئاخاوتنمان هەیە، یەکەمیان ئەوەیە کە ڕۆژانە کاروباری ژینمان پێیەوە بە ڕێدەکەین، کە ئەوەشیان دارشتنی دەنگ و سەداو ڕێکخستنی دەوێت، ئەگینا نابن بە ئاخاوتن، بەڵکو تژی هەڵە دەبێت، دووەمیان ئەو ئاخاوتنەی کە بە شێوەیەکی بەخشانئامێز دەنووسرێن، وەك چیرۆك و ڕۆمان و رەخنە و پەخشان، ئەمانەش دەبێ پتەوبن، کە لە ئاستێکی بەرزتر دان لەوەی پێشوو، لە ڕووی دیقەت و ڕێکییەوە، بەڵام جۆری سێهەم کە باڵاترین ئاستی ئاخاوتنە بە نووسین، ئەویش شیعرە، کە هەڵگری برێکی زۆر لە ڕێکخستن و دیققەت و بژارکاری دەوێت، جا ئەگەر شیعر ئەو دیقەتەی تیا نەبێت دەچێتەوە ئاستی یەکەم، بۆ نموونە من بۆخۆم کە بیرۆکەی شیعرێك دادەڕێژم، بە دەیان جار بەسەریادا دەچمەوە، پاکی دەکەمەوەو لە گرێوگۆڵ و زیوان، چەندین جار بۆ خۆمی دەخوێنمەوە، ئینجا بڕیاری بڵاوکردنەوەی دەدەم، ئەو شاعیرانەی تۆ باسیان دەکەی، شاعیری گەورەن ، ئەزموونیان هەیە، ئەگەر ئەو خەسڵەتەیان نەبێت، کەواتە شاعیری باش نین، ئێمەیش لە ناو شاعیرانی کورد، ئەم دیقەتبازو بژارکارانەمان زۆرن، بایەخ بە بەرهەمی خۆیان دەدەن و بە پێگەیشتوویی بڵاویان دەکەنەوە، ئاخر وەك گوتم شیعر ڕاقیترین شێوەی ئاخاوتنە، نابێت لەم ئاستەدا دابەزێت.

**- یەکێ لە شاعیرە گەنجەکان، لە نەوەی دوای ئێوەن، واباسی تۆی کردووە، کە تۆ چەشنی مار، هەمیشە کاژی خۆت یا کراسی خۆت فڕێ دەدەی و هی تازە لەبەر دەکەیت، لە مەودای شیعر نووسیندا، ئەمەمان بۆ لیکدەیتەوە باشترە؟ وەك چۆن لە شیعری وەرە ماڵەکەی من هیچ کراسێکت نەهێشتۆتەوە؟**

من کاك حەمە عەباسی شاعیر دەناسم و شیعرەکانیم خوێندۆتەوە، کە شتێکی ئاوای نووسیوە، هەلبەت ئەزموونی منی خوێندۆتەوە، بەدوای شیعرەکانی مندا چووە و دیراسەی کردووە، بۆیە باش دەزانێ کە من لە شیعرێك بۆ شیعرێکی ترجیاوازم، ئەو هەستی بەو جیاوازییە کردووە، باسی لە دیاردەیەکی گرینگی شیعرەکانی من کردووە، باشی بۆ چووە، لەوکاتەی کە ئەو دەزانێ زۆربەی ئەو شیعرانەی لە نێوەندی ئەدەبی کوردیدا بلاو دەبنەوە، هەموویان وەك یەکن، بە گشتی، شاعیری وا هەیە شیعرەکانی وەك یەکن و گۆڕانیان تیا نییە، پرۆسەی نووسینی شیعر پێویستی بە بەرچاو گۆڕین هەیە، پێویستی بە ڕەنگی جیاجیا هەیە، دەبێ ناوە ناوە کاژی شیعری خۆی فڕێدەیت، تا بزانین ئایا پەرە بە ئەزموونی شیعری خۆی دەدات، یا وەك ئاوی گۆمەکان وەستاوە؟ لە شیعری وەرە مالەکەی من دا، کە ترۆپکی داهێنانی شیعری بوو، تۆش لە کۆمێنتێکا نووسی بووت، دەبێ ئەو شیعرە لە ناو کریستال پێناسە بکرێ، شیعری وەرە مالەکەی من، ئەو مالەی کە تەواوی خۆشەویستی و ئیشق و پاکی تیایە ، هاوارێکە بۆ کۆبوونەوەی هەموومان لە نێو مالی ئیشق و جوانیی، ئەمە بانگی هیومانیزمییەتە، دەبێ شیعری ئەشق و خۆشەویستی بانگ بێت، بۆ مرۆڤایەتی نەك بانگ بێت بۆ بە موڵك کردنی ئافرەت و جوانیی، بانگی بەرز کردنەوەی بەهای ئافرەتە لە پیگەی ، نەك بانگی راخستنی جێگەی، شیعر قبوولی نابەهایی ناکات، ئەگەر بشیکات، ئەوە لە

تـەوەری شـیعر دەردەچێـت و دەبیتـە کـارێکی مافیـایی و قەرسـەنە دژی ئـافرەت، و بۆیـە سـەرنجم داوە کـە ئـەم شیعرە چەند بە خێرایی چووە ناو ماڵەکانەوە، لە پەنجەرەو دەرگای ماڵەکاندا گیری نەخواردووە، رامانی بۆ کراوە، من نامەوێ بە خۆم باسی ئەو شیعرەی خۆم بکەم، ئەوە کاری خۆشەویستانی شیعری مرۆڤایەتییە.

- جاران نەك لە ناو كورد، بەڵكو لەناو گەلانی تریش قەسیدەی بەرگری و بەرەنگاری هەبوو، بەڵام ئێستا نەماوە، یا زۆر كەمبووە، لەو كۆڕەی ئەم دواییەتدا قەسیدەی نیشتیمان پانتاییەكی فراوانی داگرتبوو، بەڕای من رووی شیعرەكە لەوانە بوو، كە نیشتمانیان بیر بێتەوە، وەرس بوونێكی شاعیرانەی زۆری لەوانە تیا بوو، ئەی تۆ چی دەڵێی؟

سەیرکە ئەو شیعرانەی کە بۆ خاك و نیشتیمان دەنووسرێن، شیعری پیرۆز و موقەدەسن، سەرنجی ئەوەم داوە کە وردە وردە خۆشەویستی خاك و نیشتیمان لە ناو گەنجان بەرەو کزی دەچێت، لە کاتێکا کە ئێمە بێکەسترین نەتەوەی سەرزەمینین، زمان وردە وردە بەرەو بێ بەها بوون دەچێ، لە کاتێکا تەنها تۆزێ زمانەکەمان ماوە و لەناو نەچووە، لە هەموو لایەکەوە جەهل و فام نەکردنی بەهای نیشتیمان پەنگاوەی داوەتەوە، جا پەیامی نووسەرو رۆشنبیری چییە، ئەگەر خۆشەویستی ئەو نیشتیمانە لەلای ئەوانە قوول نەکەنەوە، دەبێ هەولی ئاشتکردنەوەیان بدەین لە گەل خۆشەویستی خاك، ئەگینا بەرەو لەناوچوون دەچین، هەموو کولتوورمان لەناو دەچێ، شارستانییەتمان نامینێ، بۆیە هەندێ وردە شتم دەربارەی خۆشەویستی نیشتیمان نووسیوە، بەلام من لە روانگەیەکی شیعری بەهێزەوە نووسیومە نەك دارشتنی دروشم و دروشم کاری، هەموو شیعری دونیا شیعری بەرگری و بەرەنگارییە، چونکە لە بنەرەتدا بەرگری لە بەها جوانەکان دەکاو بەرەنگاری ناهەمواریەکان دەبێتەوە، شاعیر کە شیعر بۆ خۆشەویستی دەنووسێ، ئەوە داکۆکی کردنە لە بەهای ئینسانی ، هەول دەدات لە رێگەی شیعرەکانییە، مرۆڤ بەرەو پاکی و خۆشەویستی ببات، بۆیە ئەمە دیاردەیەکی تایبەتییە لە شیعردا، بەلام مەبەستی تۆ ئەو شیعرانەیە کە شاعیر دەیاننوسێ، لە پێناوی رزگار بوون لە زولم و بۆ لەناو بردنی داگیرکەرو نەهێشتنی ئەو

تاوانانەی دەرهەق بە مرۆڤ دەکرێت، بەتایبەت لەناو ئەو میللـەت و نەتەوانـەی کـە تـا ئێسـتا لـە ژێـر دەسـتی داگیرکەرانن و خاکیان داگیر کراوە، بۆیە شیعری مقاوەمەی تیا دەنووسرێت، بۆ ئەوەی ڕۆڵەکانی خۆیان هانبدەن تا بە گژ داگیرکەران بچنەوە، وەك ئەو سەردەمانەی کە خەباتی ڕزگاریخوازی گەلەکەمان لە ئارادابوو، بە هەزاران شیعری موقاوەمە سەریهەڵدا، کە فۆرم و ناوەڕۆکی تایبەتی خۆیان هەیە، جیاوازن لەو شیعرانەی کە لە ناو کەش و هەوایەکی ڕامان و دامانئامێزدا دەنووسرێن ، جا هەر کاتێ ژیان بەرەو ناخۆشی دەچێ و دوژمنان هەوڵی داگیرکردنی خاك بدەن، شیعری بەرگری سەرهەڵدەدات.

**- خوێندنـــەوە بـــۆ شـــاعیر گرینگـــە، یـــاخود جـــۆری خوێندنـــەوە بـــۆ شـــاعیر زۆر پـــڕ بایەخـــە، شـــتێك لەمبارەیـــەوە بـاس بکـــەی بـــە تایبـــەت بـــۆ گەنجـــەکان سوودی دەبێت؟**

لـه وەڵامـێکی دیکەشـدا، بـاسی ئـەم بابەتـەم کـردووە، خوێندنـەوە نـەك هـەر گرینگـە بـەڵکو بناغـەو دارێـژەری بیرۆکـە و بابــەتی شــیعرییە، بــەبێ خوێندنــەوە ماشــینی بیرکردنەوەی مرۆڤ دەوەستێ، شیعر لە پەلوپۆ دەکەوێ، خوێندنەوە خوێنی شیعرە، چونکە ئەوانەی دەخوێننەوە، دونیـا بـە هـەزاران ڕەنگـەوە دەبیـنن، مـرۆڤی جیـاوازن، شـاعیری خوێنـەر زیـاد لـە ئینسـانێکە و هـەموو ڕۆژێ دەگۆڕێـت، بیرۆکـە و بابـەتی قـووڵ و دەگمـەنی دەسـت دەکەوێت، بە پێچەوانەوە ئەو شاعیرانەی کە ناخوێننەوە، کـەمتر لـە مـرۆڤیکن، بۆیـە خوێندنـەوە پرۆسێسـێکی مەفادارە و بە تایبەت بۆ ئەو گەنجانەی خەریکی شیعرن و ئەزموونێکی ئەوتۆیان نییە، کەپێیەوە تەلاری شیعرەکانیان بەرزکەنـەوە، بیرم دی من خـۆم لـە ساڵانی زووی تەمـەنم دەستم بە خوێندنەوە کردووە، تا لە خوێندندا گەیشتم بە یەکی ناوەندی، تەواوی ئەدەبی کلاسیکی کوردی و زۆر لە ئەدەبی کلاسیکی عەرەبیم خوێندەوە و چیرۆك و ئەفسانە و بەخشانی زۆرم خوێندەوە، ئینجا توانیم لە زۆر شت بگەم، بە کورتی ئێمە دەبێ دونیا بخوێنینەوە، ئەمەش لە ڕێگەی کتێبەوە دەبێت، کتێب سەرچاوەی هەموو مەعریفەکانە، بەمجۆرە دەبینە خاوەنی دیدو دیدگا و جیهانبینی خۆمان.

- باشـه جـاران كـه بـاس لـه شـاعیران دەكـرا، دەیـانگوت شاعیری كوردستان، ئێستا دیاردەی شار هاتۆته ئاراوەو دەڵـێن فـلان شـاعیری سـلێمانی یـا دهـۆكی چـۆن لـەم دیاردەیه دەگەی؟

ئەمە بـیروڕایەکی سـەقەتە، ئەدەب و ڕۆشـنبیریی بە تایبەت شیعر، خۆکاری شارو گەڕەك نییە، سەردەمی ئەوە بە سەرچووە، داهێنان لە قالبی شوێن و جوگرافیا خەست بکەینـەوە، زۆربەی داهێنـەرانی دونیـا دوای ئەزمـوونێکی دوورو درێـژ داهێنـانی خۆیـان پێشـکەش بە مرۆڤـایەتی کـردووە، ئەدەب ئەزمـوونی دەوێ، تێگەیشـتنی دەوێ لە ماهیەتی دونیاو مەعـریفەدا، ئەو هەڵچوون و حەماسە بێ مانایەی ناوێ، بۆ خاتری شارو شارچییەتی، ڕەنگە لە سەد سـاڵ یەک نووسـەرو یەک شـاعیری بـاش لە نێـو نەتەوەیەک دەرکەوێ، بە تەئکیـد ئەویـش یەکـێکە کە ئەزمـوونێکی زۆری هەیە، بـۆیە ئەو مـۆدێلە لەو جـۆرە بۆچوونە نوێنەرایەتی کەف و کوڵی نەشارەزایی دەکات، من زۆر لە گەڵ ئەم بۆچوونە نیم، بۆیە دەبێ هەڵوەستەیەک بکەین و بزانین بۆچی و لە پای چییە، هێندە بە پەلەین، لە ژیـانی ئەدەبی نەوەکانـدا، هێنـدە بـە شـاری خۆیانـەوە شـەتەکیان بـدەین، سـەیرکە بـورخیس، نووسـەرێکی مەزن بـوو، بەدرێـژایی تەمەنی خـۆی ئەزمـوونی کـۆکردەوە، دایستوفیسـکی مەزن بـوو ، بە درێـژایی تەمەن ئەزمـوونی کـۆکردەوە، هەروەهـا نـالی، هیگـۆ، شـیللی، سـاراماگۆ و بەهەزاران هەزار داهێنەری تر، کە هەموویان بە تەمەنەوە ئەزموونی خۆیان پێشکەش بە نەوەکانی دوای خۆیان کرد، نەوەی دوای ئەوان نەیانگوت کـە ئەمانـە خـەڵکی کـوێن، بەڵکو گوتیـان، ئێ، بـەڵکـو هـەموو بـە سـامانی مرۆڤایـەتیان دانـاون، ئـێمە وەک ئەوان نانووسـین بە سـتایلی خۆمـان

کاردەکەین، بایەخیش لە ئەزموونی ئەوان وەردەگرین، بۆیە نەوە لە دوای نەوە بوونە خاوەنی داهێنان و ستایلی خۆیان.

ئێستاش خەڵکە سادەکە، کە مەبەستمە بڵێم خەڵکی دەرەوەی نێوەندی ئەدەبی، هیچ کات ناوی شاعیرێك ناهێنن بە شار، بەڵکو دەڵین فلان شاعیرێکی کوردستانییە، ئەوە نێوەندە ئەدەبیەکەیە، کە لە ئەنجامی گیرمە و کێشەی نێوانیان،کە ڕەنگدانەوەی لایەنگیریی سیاسییە، بۆ ئەوەی یەکتر بچووك بکەنەوە، دەڵێن فلان شاعیری دهۆکی یا هەولێری یا سلێمانی و هەندێ جار بچووکتریشی. دەکەنەوە دەڵێن فلان شاعیری کۆیە یا رانییە یا سۆران، هەندێجار لەوەش بچووکتری دەکەنەوەو دەڵێن فلان ڕۆماننووسی گەڕەکی کانێسکان یا تەیراوە، ئەمەناشیرینترین دیاردەی نیوەندی ئەدەبییە، نەك نێوەندە گشتییەکە، بە داخەوە کە هەمووی ڕەنگدانەوەی سیاسەتی ئەمڕۆی کوردستانە، لە بەر ئەوەی لایەنگیریی سیاسی زاڵ بووە بەسەر ئینتیمای نیشتمانی، دیاردەیەکی زۆر قیزەوەنە، لەڕاستیدا هەر شایانی باسکردن نییە، بۆیە من نامەوێ زۆر لەبارەی ئەم بەدبەختییەوە قسە بکەم ، چونکە چەند لەسەر ئەم بابەتە بڕۆم، ئەوەندە دەبێ باس لە کێشە قیزەوەنەکانی تر بکەم، کە هەمووی لە دایکبووی یەکترن.

- تۆ پێتوایه  نووسین و لێکۆڵینەوە و بە دواداچوونەکان و ڕەخنــەی شــیعریی، شــوێنی خــۆی، وەك گوتــارێکی هاوچەرخ، لە نێو تێکڕای ژانرەکان کردبێتەوە؟

من پێموایە بەڵێ، کارێك کراوە لەم بوارەدا، ڕەنگە هەموویان باش نەبن، بەڵام لە نێو بەرهەمێکی زۆروبۆریشدا هەندێ نووسینی جوان و بایەخدار، وەك گوتاری ڕەخنەیی لە نێو شیعردا دەبریقێنەوە، ئێمە ناکرێ زەرب بە سەر هەموو نووسینەکاندا بهێنین، گوتارگەلێکی زۆر هەن دەتوانین پشتیان پێببەستین بۆ هەڵسەنگاندنی بزاوتی شیعریی تازە، هەڵبەت ئەمە هەر لە مەودای شیعردا نییە، بەڵکو تێکڕای ژانرەکانی دیکەش هەر وان، بە تایبەت کە ڕەوتێکی باشی نووسینی گەنجە ڕۆشنبیرەکان هەیە، بە ئەقڵێکی مەعریفی و ڕۆشنبیرییەوە، هاتوونەتە نێو مەیدانەکە و بەرهەمی ڕەخنەیی خۆیان بڵاو کردۆتەوە، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کە گوتاری هاوچەرخ و تازە و کراوە بەسەر ڕۆشنبیریی تازەدا، پێویستی بە خۆبەستنەوە بە میتۆدە هاوچەرخەکانەوە هەیە، دەبێ پشت بە تەوژمە تازەکانی ڕەخنە ببەستێت، نابێ هەر لە ناو کەوانەی ڕەخنەی کلاسیکیدا خۆی قەتیس بکان، لە دونیای ئێستادا گوتاری ڕەخنەیی تەنها بە هەڵسەنگاندن ناوەستێ ، ئەمڕۆ فەلسەفە مەعریفییەکان تێکەڵی گوتار دەبن، واتە ئیشی ڕەخنە گۆڕاوە، فەلسەفەی هەڵوەشاندنەوە و بونیاتگەریی و شیکاریی و سایکۆلۆژیی و سۆسایەتی بەهێز، خۆیان نمایش دەکەن و وایان لە گوتاری ڕەخنەیی کردووە، کە حاڵەتەکانی پێشوو جێ بهێڵێ و بکەوێتە سەر هێڵی فەلسەفی.

**- تۆ وەك شاعیریك چۆن ئەو شەپۆلە نووسینەی رۆمان دەبیـنی، ئایـا ئەمـە پەبوەسـتە بـە پێشـكەوتنی بـواری ئەدەبی كوردییەوە،یاخود مۆدێكە هاتووە ؟**

ئەمەیان زۆر سرووشتییە، حالەتێکی قەیسەری نییە، لە نێو هەموو ئەدەبی دونیادا هەیە، ئەدەبی کوردیش بەدەر نییە لەوانە، بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ شیعر لە سەرووی هەرەمی ژانرە ئەدەبییەکاندا بوو، دەخوازم بڵێم زۆربەی نووسەرەکان خەریکی شیعر بوون، ئەوانەیش کە تازە دەستیان پیدەکرد هەر بە شیعر دەستیان پێدەکرد، بەڵام پەرەسەندنی رۆشنبیریی کوردی لەو ساڵانەی دواییدا هێز و گوڕێکی بە تینی دا بە بەشداریکردنی نووسەران لە پرۆسەی تازەکردنەوەو رەنگاورەنگ کردنی کولتووری کوردیدا، بزاوتی وەرگێڕان لەم بوارەدا کاریگەر بووە، بەسەر ئەوەی کە رۆمان نووسین ببێتە دیاردەیەکی بەهێز، خوێندنەوەی هەموو ئەم رۆمانانەی وەرگێڕدراون بۆ زمانی کوردی، زۆر کاریگەر بووە بۆ سەرهەڵدانی رۆمان نووسین لە ئەدەبی کوردیداو لە کەوانەی مۆدە چۆتە دەرەوە، بەڵکو پەرپیوەتەوە بۆ زەروورەت، ئەمرۆ لە کوردستان رۆمانگەلێکی مەزن دەنووسرێن و لە ئاستێکی بێ خەوشدایە، رۆمانەکانی بەختیار عەلی و شێرزاد حەسەن و کەریم کاکە و جەبار جەمال و سەلاح عومەرو سمایل حەمەدەمین و نەبەز گۆران و گەلێکی دی، نەخشەی ژانرەکانی ئەدەبیان گۆڕیوە، کولتووری کوردییان دەوڵەمەند کردووە، بۆیە ئەم شەپۆلە نووسینەی رۆمان کولتوری کوردییان دەوڵەمەند کردووە، رۆمان، نیشانەی پێشکەوتنی کۆمەڵگایە بەرەو شارستانییەت.

**- لە پرۆسەی نووسینی خۆتا، زۆرجار دەچییەوە ناو گێڕانەوەی ئەفسانەیی، یاخود خەڵق کردنی دەق لە ئەفسانە، تۆ دەتەوێ چی بڵێی لەم بابەتەوە؟**

من هەرگیز لە شیعرەکانمدا نەچوومەتە ناو گێڕانەوەی ئەفسانە، بەڵام من ئەفسانەم وەکو سیمبۆل و ماسك بەکار هێناوە، ئەوەشیان لە دیوانە سەرەتاییەکانمدایە وەك دیوانی خاك و هەڵۆ و تەمەسپییەکانی ڕۆح، کە هەندێ موفرەداتی ئەفسانەییم وەکو سیمبۆل بەکار هێناوە، پاشان لە دەقی درامی خۆمدا وەکو ماسك بەکارم هیناوە، هەندێ جاریش لە شیعرەکانمدا خۆم ئەفسانەم خەڵق کردووە، بە تایبەت لە دەقەکانی درامیم وەك دەقی شانۆیی شیعرییم، ئەفسانەی زەریە شێتەکان و سوارانی بەفر و ئاسیە خاندا ، کە تا ئێستا نەمکردوون بە دیوانێکی شیعری تایبەت، ڕەنگە لە داهاتوودا هەرسێ ئەو شانۆییە شیعرییانە بکەم بە کتێبێك، هەڵبەت مەسەلەکانی بەکار هێنانی ئەفسانەو لە شیعر زۆر گرینگە، پێویستی بە کارامەیی شیعریی هەیە و لە زۆر شیعریی جیهانیدا بە کار هاتوون، ئەفسانە نوێنەرایەتی ئەقلی سەرەتایی ئینسان دەکات، بەڵام من دواجار لە دیوانەکانی تری خۆمدا، ئەم قۆناغەم جیهێشتووە، چونکە ئەزموونی شاعیر پێویستی بە گۆڕان و نوێبوونەوە هەیە، بوارەکانی ڕۆشنبیریی شاعیر لە گۆڕاندان، بۆیە هەموو شاعیرێ پێویستی بە زەخیرەی تازەی فیکری هەیە، تا بتوانی لە گەڵ گیانی سەردەم بگونجێت.

**- تۆ ساڵانێکە بێدەنگی لە نێو کۆڕە ئەدەبییەکاندا، کەم گوێم لە دەنگی تۆ بووە کە شیعر بخوێنیتەوە، ئایا ئەمە هۆی ئەوەیە لە - ئیلقای – شیعر دەترسی یا غرورێکە ؟**

شاعیر ئەو کاتە بێدەنگ دەبێت کە دەمرێت، ئەوە بێدەنگی شاعیر نییە، کە بەشداری ناکات لە کۆڕو کۆبوونەوەکاندا، یا بە شداری نەکردن لە کۆڕە شیعرییەکاندا، مانای ئەوەنییە کە شاعیر ئیلقای نییە، بەڵکو ئەم بەشداری نەکردنە هۆی تری هەیە، جا کاکی نازم یا ئەوەتا تۆ موتابەعەت نەماوە، یا ئەوەتا حەزت لێیە، بمدوێنی و بچمە سەر باسی هەندێ مەسەلە، کە من خۆم حەزیان لێناکەم، ئەگینا من بابی شیعرەکانی خۆم، کۆڕی شیعریم کردووەو کۆڕی ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنیم ئەنجام داوەو لە فیستەفالەکانیش بەشداریم کردووە، بەڵام من خۆم دەپارێزم لە زۆر شتی ئەو کۆڕو کۆبوونەوانە، ئەویش بەو مانایە نییە کە گۆشەگیر بم، بەڵام هەندێ جار گۆشەگیریش، سوودی خۆی هەیە، ئەمڕۆ دوای ئەو تەمەنە لە نووسین و بڵاوکردنەوە و بەشدارییەکان، کاتی ئەوە هاتووە، بکەوینە نێو ڕامان دامانەوە، لە خۆمان بخەفتین، بکەوینە ناو کارکردن لە پێناوی پێشکەش کردنی شتی نوێ و تازە، بۆ ئەوەیش دەبێ کاتەکانی خۆمان، بە خوێندنەوە بەسەر بەرین، بە تایبەت ئەمڕۆکە بڵاوبوونەوەی کتێب و گۆڤارو ڕۆژنامەکان، ئەوەندە زۆر بووینە ، ئەگەر خافڵ بین زۆر شتمان لە دەست دەچێ، بۆیە بێدەنگییەك لە ئارادا نییە.

**کتێب:**

کتێب وەك دەڵێن حیکمەتی بوونە، سەرچاوەی هەموو ڕووداوەکانی دونیاو جوانییەکانی دونیایە، بێ کتێب ژیان بێ جەوهەرە.

**قەڵەم:**

نەهامەتییەکی گەورەیە ئەگەر لە دەستی گەوجان بێت و بەخششێکی مەزنە ئەگەر لە دەستی نووسەری خۆی بێت.

**شۆڕش:**

بۆ ئەو سەردەمە خۆش بوو، کە باوی هەبوو، ئێستاکە بریقەی جارانی نەماوەو لە دونیای پێشکەوتووی ئەمڕۆکەدا، شۆڕش چەمکێکی تری وەرگرتووە.

**شەو:**

لە دونیای کلاسیکدا هەبوو، ئێستاکە شەو نەماوە، تەنها لە دڵە تاریکەکاندا شەو هەیە.

**دایك:**

تاپۆی بوونی بەشەرییەتە، نەزمێکی حەزینە لە دونیای ئافرەتانی کورد، میهرەبانی و بەزەییە.

**ئەمریکا:**

بـۆ مـن رووخێنـەری ڕژێمـێکی سـەرکووتکەری لـە بـن نـەهاتووی بـەعس بـوو، ئـەو بـوو هەناسـەیەکی دیکـەی بـۆ کـورد بـە ڕەوا بینی، هـەن دەڵێن بـەرژەوەنـدی خـۆی بـوو، بەڵام بۆمن واکەوتەوە، بەرژەوەندی منیشی تیا بوو.

**باشووری کوردستان:**

نەغمـەی سەرمەشـق و رابـەری سـەر هەڵـدانی هـەموو کوردستانە.

- زۆرجـار سـەرنجی ئـەوەم داوە تـۆ کـەمتر بەشـداری دەکەی لە گفتۆگۆی دانیشتنەکان، سەبارەت بەشیعرو مەسەلەکانی شیعر، حەز دەکەم هۆی ئەمە بزانم؟

ئەمـەیان دەگەڕێتـەوە بـۆ خـووی مرۆڤـەکان خۆیـان، هەندێك حـەز دەکـەن بەردەوام قسـە بکـەن، هەنـدێکیش جارجـار و هەنـدێکیش هـەر بەشـداری ناکـەن، مـن خـۆم زیاتر حەز بە گوێگرتن دەکەم نەك زۆر بەشداریکردن، زۆر لەو دانیشتنانە دانیشتووم، تێبینی ئەوەم کردووە، ئەوەی کـە شـتێك نـازانێ لـە هـەمووان زیـاتر قسـە دەکـات، قسـەکردنیش دەربـارەی شـیعر و مەسـەلەکانی شـیعر، پێویسـتی بـە راهـاتنی رۆشـنبیرییەوە هەیـە، بـەبێ هـێزێکی مـەعریفی ئـەدەبی و شـارەزایی و خوێندنـەوەی زۆری سەرچاوە شیعرییەکان، ناتوانین قسە لە بارەی شیعرەوە بکەین، ئەگەر بەشداریش بکەین، قسەکانمان ناچنە ناو بیروڕایـەکی تۆکمـەی رۆشـنبیرییەوە، زۆرجـار بابـەتێك یـا سەرەباسـێکی مـەعریفی فڕێدەدەمـە نـاو گفتوگۆکـان، بـۆ ئەوەی لایەنە شاردراوەکانی شیعر باس بکەین، تا بگەین بە دیالۆگێکی باش و سوودبەخش، بەڵام سەرنجم داوەتێ لەو جـۆرە سـاتانەدا بێدەنگییـەك دانیشـتنەکان دادەگـرێ، کـە بێدەنگی بێ ئاگاییە لە بابەتەکە، بۆیە هەموو ئەو قسانەی لـەبارەی شـیعرەوە دەکرێـت، کـەمیان نـەبێـت، هـەمووی قسـەی گشـتی و هاکەزاییە، جگە لە بەخەرجدانی کاتەکە، هیچی دیکە مەبەست نییە، بۆیە جۆرێك لە بێهوودەیی لە لای من دروست دەبیت، هەر بەراستیش گفتوگۆ لەبارەی شـیعر جۆرێکلـە ئـەزموونی خوێندنـەوە و کتێبکووشـینی دەوێت، بەردەوامبوونی بەهێزکردنی پەیبردن بە نهێنییەکانی شـیعری دەوێـت، ئێ شـیعر دەریایـەك نهێـنی هەیـە، کـە

شـــارەزایان نـــەبیت، ڕەنگـــە بەرشـــەپۆلیٚ بکـــەویت و لـــە قسەکردن بکەویت، وابزانم لەم نهینییە گەیشتی.

- راشـــکاوانه پــێم بــڵێ نەک کـــاریگەریی، بەڵکـــو خوێندنەوەت بۆ ئەو شاعیرانەی سەردەمی خۆت چییە و شـیعری کامەیـان زیـاتر دەخـوێنیەوە، ئایـا جـۆرئەتی ئەوەت کـــردووە چ بە نووســـین یـــا رووبەروو سەرنجەکانت دەربڕی؟

ئەو شاعیرانەی سەردەمی خۆم ، هەموویان هاوڕێ و دۆستی ئازیزن، ئەوە چ پەیوەندیێکی هەیە بە جورئەتەوە، تا قسەیان لە بارەیەوە بکەم، مەسەلەی جورئەت کاری بە مەیدانێکی ترەوە هەیە، نەک بە مەیدانی شیعر، مەیدانی شـــیعریش لە یەک گەیشـــتن و هـــاوبەشی کـــردنە لە بابەتەکـان، بـۆ وەڵامی ئەم پرســیارەت پەنـا دەبەمە بەر بیروڕام دەربارەی شیعرو ئەدەبیات، کە ڕەنگە وەڵامەکەم ببیستی سەبارەت بە پرسیارەکەت، بێ ئەوەی باسی هیچ کامێک لەوانە بکەم، من پیمـوایە کاری نووسینی شیعر، کاری دزینی ئاگرە لە خواوەندەکان، بۆیە ئەم کارە یا ئەم فەلسـەفەیە، لە پرۆسێسیـ نووسـینی شـیعر بە هەمـوو کەسـێک نـاکرێ، ئەوانەی خەریکی ئەم کـارە سـەختەن، کە بە هەق بە سەر چیا هەڵگەڕانە، دەبێ ئەزموونێکی گرنگیـــان هەبێ لەمەڕ کـــاری ئەشـــقیا بـــوون و کـــاری پرۆمیتـــۆسی، ئەگینـــا هەر زوو دەکەونـــەوە بەر زوڵـــمی زەیۆسـەوە. ئێ خـۆ هەمـوو نووسـینێکی شـیعر مانـای ئەوە نیـیە، کە شـــیعرییەتی لێبێـتە کـاییەوە، یـاخود شـــیعری ڕاســتەقینە بێــت، ئێســتا لە کوردســتان خەڵکـانێکی زۆر خەریکی شـیعر نووسـینن، لە هـاوڕێ و خەڵکانی تـر، ئەو جورئەتە لە کوێ بهێنم و بڵێم کوڕینە واز بێنن و خەریکی کارێکی باشتربن، بۆیە کاری شاعیری ڕاستەقینە ئەو دادگایی کردنە نیە، بەڵکو کاری ئەو پێشکەشکردنی داهێنانەکانی خۆیەتی، کە ببێتە هۆیەکی گەورە، بۆ ئەوەی بە خۆیان دا بچـــنەوە و لە چەمـــکی داهێنـــان بـــگەن، مـــن شـــیعری

هەموویان دەخوێنمەوە و سەرنجی تایبەتیشم هەیە، بەڵام ناکرێ بە تۆرێک راوی ئەم لێشاوە بێ مانایەی شیعر بکرێت، کە زۆربەیان نە ئەزموونێکیان هەیە نەخوێنەریشن و نە شارەزای زمانن.

- تـــا چەنـــد بـــڕوات بەوە هەیە کە دەڵـــێن هەر لەمنـدالییەوە بەهـرە هـەبووە، لە کاتێکـدا تـۆ لەنـاو گێلەوێـژەی ئەوسـای سـەرەتای ژیـان، کـۆمەڵێ شـت هەبـووە لەنـاو هەسـتی منـدالیت گیـنگلی داوەتـەوە، ئەمەیان چۆن لێکدەدەیتەوە؟

سەبارەت بەو پرسیارە کە ئاخۆ کاریگەرێتی منالی لە نێو پرۆسەی شیعریدا چ ئاکامێکی هەیە، ئەوەیان بابەتێکی زۆر تایبەتە لە ژیانی هەموو شاعیریکداو هەمیشە ئەو پرسیارە لە شاعیر دەکرێت، چونکە بابەتێکی زۆر پڕ ماناو ئەزموونبەخشە، ناکرێ فەرامۆش بکرێت، شاعیر وەکو هەر کەسێکی دی دەکەوێتە ژێر کاریگەرێتی ژیانی منالیی خۆیەوە، مەرجیش نییە ئەو کاریگەرێتییە تەنها گوزارشت لە داهێنانی دەقێکی شیعری ئەرێنی بکات، زۆر جار ئەزموونی منالی دەقێکی پڕ ئازارت پێدەبەخشێ بەلام شاعیر زۆر بە زەحمەت دەتوانێ دەقێکی پڕ لە داهێنان سەبارەت بە کایگەرییەکانی منالی خۆی پێشکەش بە خوێنەران بکات، ئەمە پەیوەستە بە کاری یادەوەری بەهێز و رۆشنبیرییەکی قوول، ئەگەر سەیری ئەزموونی شاعیرانی دونیا بکەیت، ئەوەت بۆ روون دەبێتەوە کاریگەرێتی منالیی، مانای ئەوە نییە تۆ باس لە سەردەمی منالێتی خۆت بکەیت، **رامبۆی** شاعیری فەرەنسی نەهاتووە باس لە سەردەمی منالی خۆی بکات، یا بۆدلێر نەهاتووە موعاناتی سەردەمی منالی خۆی کۆ بکاتەوە، یا کافکای چیرۆکنووس نەهاتووە باس لەوە بکات کە منالی ئەو چۆن بووە، بەلکو ئەوانە هەستاون داهێنانێکیان کردووە رەنگدانەوەی سەختی ژیانی ئەومنالییەیان بووە، خۆیان لە رێگەی داهێنانەوە بە خوێنەرانیان وتووە، بێ ئەوەی باسی منالێتی خۆیان بکەن، کە خوێنەر یەکسەر دەگاتە ناسینی کرۆکی ژیانی منالێتی ئەوان.

- ئەگەر بمەوێ كۆتایی بەم دیدارە بهێنم و بپرسم ئاخۆ لە ماوەی ئەم چەند مانگەی دیمانەكەدا، یەكێ لەو یادەوەرییە خۆشانەی كە پرسیارەكانم وروژاندوویەتی، كامەیان بوو؟ هەروەها ئەگەر بكرێ پانۆرامایەك سەبارەت بە كۆی بەرهەمەكانت بخەیت ڕوو جێگەی خۆیەتی؟

خـۆی ئـەم دیـداره زیـاتر گێڕانـەوەی یـادەوەریی و بەسەرهاتی بزووتنەوەی ئەدەبیی بوو، زیاتر لەوەی کە بە قووڵی باس لە کێشە ئەدەبییەکان بکەین، گەڕانەوەیەك بوو بۆ ڕابردوو، کە ئەمەش زۆر پێداویستییە، چونکە تاوەکو ئێستا ئێمە ڕابردوومان هێندە بە خەمەوە باس نەکردووە، هێزی باس کردنی ئێمە لە ڕوانگەیەکی وەسفی وەستاوە، لە ڕوانگەیەکی ڕەخنەیی قووڵ نەبۆتەوە، کاتی خۆی کە **ئەدۆنیس** ویستی پرۆژەی خۆی لە بواری کولتووری عەرەبی بە گشتی بۆ خوێنەران ڕابخات، یەکەمین شت لە خەیاڵی ئەوە بوو ، کە لە ڕوانگەیەکی ڕەخنەییدا باس لە ڕابردووی خۆیان بکات، ئەوە بوو کە کتێبی **الثابت والمتحول** ی لە سێ بەرگدا ئامادە کرد، کە سەراپای باری ئەدەبیی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئایینی، هەمووی هەڵڕشت و شیکردەوە، پاشان هاتە سەر مەسەلەکانی نوێ بوونەوە و داهێنانەکان، بە داخەوە ئێمە تاوەکو ئێستا لە نێو ئەدەبی کوردیدا نەمانتوانیوە، بەرهەمێکی وا پوخت و جوان بخەینە بەردەستی خوێنەران تا بتوانن، دیدێك بۆ خۆیان درووست بکەن، سەبارەت بە تێکڕای کولتووری کوردی و پەیوەندی ئەو کولتوورە، بە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە ببەستینەوە، بۆ ئەم مەبەستە دەبێ باوەڕمان بەوە هەبێت هەر بە تەنها ئەدەب نابێتە ئاوێنەی نەتەوەکەمان، دەبێ ئەو قاوغە فراوانتر بکەین و ئەکتیفی بکەین، بە تایبەت شیعر کائینێ نییە لەو گۆڕە شین بێت و کاری خۆی کردبێ، بەڵکو

پەیوەستە بە کۆمەڵێك فەزای ژیانی ئێمەوە، ئەم پێشەکییەم بۆ وەڵامی پرسیارەکەت بەو مەبەستە بوو بڵێم، یادەوەرییەکان بەشێکی گرینگن لە ژیانی هەر شاعیرێك کە بە ئەزموونەوە، کاری لە نێو فۆرمەکانی شیعر کردبێت، چونکە نەتەوەی کورد لە شیعر گرینگتری نەبووە، کە ئاوێنەی ڕووداوەکانی بێت، کە بنەمایەکی گرینگی مێژوویی ئەو نەتەوەیە، من باوەڕم بەوە هەیە کە ئەم رابردووە دەتوانێ، کولتووری نەتەوە ساغ بکاتەوە، ئەوەی تۆ وروژاندت بە تەنها یەك شت نەبوو، بەڵکو تۆ لە پرسیارەکانت، هەموو یا بەشێکی زۆرت وروژاند، کە من لە نیو ئەو هەمووە دا پێمەلەم کردووە، شەپۆلێکی زۆری یادەوەرییەکانم لە دەست چووە، چل ساڵ، پەنجا ساڵ، کاتێکی گەمە نییە، تۆ بەردەوام هاودەمی ڕووداوە ئەدەبی و سیاسییەکانی نەتەوە بیت، جگە لە ڕووداوەکانی دونیای ئەدەبی و سیاسیی و کۆمەڵایەتی جیهان، بۆیە لێرەدا من ناتوانم ئەوە تۆمار بکەم کە کام لەو یادەوەرییانە منیان تاساندووە،بەڵام دەکرێت ئەوە بڵێم تۆ توانیت کۆمەڵێك شتم دووبارە وەك دیمەن بخەیتەوە بەرچاو، کە چاومی پێ ڕوون بێتەوە، لەم چەند مانگەدا، کە خەریکی ئەو دیمانەیە بووین، دونیای ئەدەب و ڕۆشنبیری و رابردوو، ئامادەگی خۆیان هەبوو، جۆرێك لە پاك بوونەوەی درووست کرد، کە ئەوە زۆر گرینگە، بۆ هەموو نووسەرێك، ئیمڕۆکەش کە کۆتایی بە دیمانەکە دەهێنین، هیشتا زۆر ماوە باسی بکەین، زۆر نهێنی و شاراوەی ناو

باسەکان ماون، شەن و کەوی بکەین، چەندین مانگ و مانگی تری پێدەوێ، کە بگەین بە کەمێك لەو مەبەستانەی دەمانەوێ قسەیان تیا بکەین، بە هەرحال من سپاست دەکەم بۆ ئەوەی کە منت رازی کرد قسە بکەم، لە کاتێکدا لە دونیای ئێمەدا هیچ جەدوایەك نەماوە بۆ قسە.

ئەوەی کە ماوەتەوە بیڵێم، سەبارەت بە کۆی بەرهەمەکانمە، خۆت دەزانی من هەر لەسەرەتای هەفتاکانەوە خولیای ئەدەب و شیعرو رۆشنبیریم هەبووە، لە رێگەی ئەم خولیایەوە هاتوومەتە ناو دونیای شیعرو ئەدەبیاتەوە، تا ساڵی حەفتاو هەشت تا دەگاتە هەشتا هیچ بەرهەمێکی شیعریم چاپ نەکردووە، هەندێ بەرهەمی شیعریم لەملاو ئەملا بڵاو دەبوونەوە لە پۆستەی خوێنەران و هەندێ شوێنێنی ترەوە، بەڵام شتێکی وانەبووە، لە ساڵانی هەشتاکانەوە بەدوا بەرهەمەکانی خۆم چاپ کردووە و بڵاوم کردونەتەوە، سەرەتا شیعرم چاپ کردووە، بۆ یەکەمین جار کە قووتابی بووم لە بەغدا، دیوانی خاك و هەلۆم بە چاپ گەیاندووە، کە دەزگای رۆشنبیری و بڵاو کردنەوە لە بەغدا بۆمیان چاپ کردووە، ئیدی پاشان بەرهەمەکانی دیکەی خۆمم بڵاو کردۆتەوە ،کە بەمشێوەی خوارەوە یە:

## ديوانی شيعری چاپكراو

- خاك و هەلۆ ، شيعر ، بەغدا – ١٩٨٠- دەزگای رۆشنبيری وبلاو كردنەوەی كوردی ، ٥٠ لاپەڕە.

- تەمە سپييەكانی ڕۆح ، شيعر ، هەولێر- ١٩٨٨- ئەمانەتی گشتی ڕۆشنبيری ولاوان ٦٨ لاپەڕە.

- وردە گەلا – ١٩٨٩_ سلێمانی

-پيانۆی ڕۆژهەلات - ٢٠٠٠ - شيعر، هەولێر چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبيری هەولێر ١٨٦ لاپەڕە.

- درەختی حيكمەت ، ٢٠٠٢، هەولێر چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبيری هەولێر ١٠٩لاپەڕە.

-دۆستێ هەميشە چاوەڕوانمانە - ٢٠٠٤ - شيعر، هەولێر، بڵاوكراوەی بزاڤی ڕۆشنبيرانی نوێخواز، ٩٨ لاپەڕە.

- پيانۆی ڕۆژهەلات – ٢٠٠٤ - كۆی بەرهەمەكان شەش ديوانی شيعرە، دەزگای ئاراس هەولێر – ٤١٥ لاپەڕە.

-بورجی بەلەك - ٢٠٠٦- بڵاوكراوەی گۆڤاری ئايندە- سەردەم ١١٣ لاپەڕ ە.

- سيفری ئاگر ، شيعر ، كەركوك ٢٠٠٧- يەكيەتی نوسەرانی كورد لقی كەركوك.

-کتێبی پیرۆزی عاشقان ، شیعر، هەولێر- ٢٠٠٧ - دەزگای ئاراس هەولێر ٢٦٤ لاپەڕە.

- تـۆ لە هەمـوو شـوێنێکی تـۆ ٢٠١٠ دەزگـای چـاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی ٢١٥ لاپەڕە.

-کتێـبی ئـاو ٢٠٠٩ دەزگـای موزیـك و کەلەپـوری کوردیـو هەولێر ١٤٤ لاپەڕە.

-کتێـبی نەی ٢٠٠٩ دەزگای مۆزیـك و کەلەپـوری کـوردی هەولێر ١٩٩ لاپەڕە.

-درەختی درەوشاوە ٢٠١١ سەنتەری لیکۆلینەوەی فیکری نما هەولێر ١٢٦ لاپەڕە.

-درەختی خامۆشی ٢٠١١ سـەنتەری لێکـۆلینەوەی فیکـری نما ١٤٢ لاپەڕە.

-سـکێلی نـاو خـۆلەمێش ٢٠١٢ لە بڵاوکراوەکانی سـەنتەری ڕۆشنبیی ڕێژیار- هەولێر ٩٦ لاپەڕە.

- کۆدیـوانی شـیعر ٣ بەرگ – لە بڵاوکراوەکانی مەڵبەنـدی گشتی یەکیەتی نووسەرانی کورد- هەولێر- .٢٠١٢-

- بەرگی یەکــــەم- ٣٧٩ - ، بەرگی دووەم – ٤٤٠ لاپەڕە – بەرگی سێیەم - ٢٤٥- لاپەڕە، چاپخانەی رۆژهەڵات.

-بەرز بەرز تا قووڵایی – شیعر – ٢٠١٤ - دەزگای موکریان ١٤٢ – لاپەڕە.

-کۆدیـوانی شـیعر دەزگـای موکریـان سێ بـەرگ – بـەرگی یەکـەم ٥٧٧ لاپـەڕە بـەرگی دووەم ٦٨٠ لاپەڕە بـەرگی سێهەم ٤٣٩ لاپەڕە. .

-تاریك بەقەد درەوشانەوە تاریك ٢٠١٦- شیعر - ناوەندی ئاوێر ١٧١ لاپەڕە.

- دیـوانی ئـەفیونی مـن - شـیعر – ٢٠١٨ – هـەولێر – چاپخانەی حیزبی شیوعی کوردستان – ١٥٠ لاپەڕە.

## نوفلێت

- کەمتیار ، نوفلیت ، سلێمانی ١٩٩٩ بنکەی گەلاوێژ سلێمانی ٧١ لاپەڕە.

-قیامەت ، نۆڤلێت ، هەولێر ٢٠٠٢ گۆڤاری یەکیەتی نووسەران لقی هەولێر- بەشێکە لە ڕۆمانی بولیفاری نەی.

-ئەسپەکانی ناو با، دەزگای ئاراس ٢٠٠٨ ١١٢ - لاپەڕە.

-بولیفاری نەی – ڕۆمان – بەڕێوەبەرێتی چالاکی وێژەیی – ٢٠١٤ – هەولێر ٢١٠ لاپەڕە.

**وەرگێڕان**

-ڕۆمانی ڕەگەکان – ئەلکسی هیلی ، لە فارسییەوە ٢٠٠٥ دەزگای موکریان هەولێر ٨٨٧ لاپەڕە.

-ڕۆمانی دوا وەسوەسەی کریست ، کازانتزاکی ، لە فارسییەوە ٢٠٠٦ دەزگای موکریان هەولێر ٦١١ لاپەڕە.

-ڕۆمانی سەفەرێ بۆ ڕۆژهەلآت ٢٠٠٢ ، هیرمان هیسە ، سەنتەری نما ، لە عەرەبییەوە ٧٦ لاپەڕە.

-کۆمەڵە چیرۆکی ، کتێب – ١٩٩٩- لە فارسییەوە.

کۆمەڵێ نووسەر ، دەزگای سەردەم سلێمانی٩١ لاپەڕە.

- لورەی گورگ ، ڕۆمان ، جاك لەندەن، لە فارسییەوە ٢٠٠٦ دەزگای وەرگێڕان هەولێر ١٥٥ لاپەڕە.

-ڕامبو – وەرگێڕان لە عەرەبییەوە – وەرزێ لە دۆزەخ – ٢٠٠٧ دەزگای سەردەم، سلێمانی ٧٠ لاپەڕە.

- ڕۆمانی دایك ، بیرل باك - ٢٠١٦ - ناوەندی ڕۆشنبیریی ئاوێر، وەرگێڕان لە فارسییەوە ٣٥٠ لاپەڕە.

-ڕۆمانی دوا وەسوەسەی کریست - دوا وەسوەسەی مەسیح- چاپی یەکەم ٢٠٠٦ چاپی دووەم ٢٠١٨ – ٥٨٧ لاپەڕە، ماڵی وەفایی- هەولێر.

- وەرزێ لە دۆزەخ – شیعری رامبۆ – دەزگای سەردەم – ٢٠١٨ - ١٠٦ لاپەڕە - سلێمانی.

-بەهەشتی ونبوو، جۆن ملتون، مەلحەمەی بەناوبانگی ئینگلیزی ٤١٠ لاپەڕە ، ناوەندی ئاوێر- هەولێر.

-سەفەرێ بۆ ڕۆژهەڵات- چاپی دووەم، ١٢١ لاپەڕە، ماڵی وەفایی

-وێرانە خاك ت . س. ئیلیەت چاپی یەکەم سلێمانی ٢٠٢٢ ١٢٧ لاپەڕە.

## ئەزموونی ئەدەبی

- بەرەو منداڵی بە جلی پایزەوە ، بناغەو ئەزموونی شیعر ٢٠٠٧ دەزگای ئاراس هەولێر ١٨٣ لاپەڕە.

-گەڵا ڕژاوەکانی ئەزموون – کتێبی گیرفان – وەزارەتی ڕۆشنبیری٢٠٠٦ هەولێر ، ٧٢ لاپەڕە.

دیدو دیدگا – دەزگای موکریان ، بیروبۆچوونی ئەدەبی و ڕۆشنبیری ٢٢١ لاپەڕە.

- ئەدەب و فەلسەفە، لیکۆلینەوە، نووسین و وەرگێڕان ٢٠٠٥ چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیریی - هەولێر - بڵاو کراوەی کتێبخانەی سۆران ٥٢٧ لاپەڕە.

- ئەدەب و فەلسەفە – چاپی دووەم – دەزگای نما – هەولێر – ٤١٥ لاپەڕە.

- کۆکردنەوەی شەونمی شیعر – ئەزموونی شیعریی و ئەدەبیم- ١٠٨٠- ٢٠١٥ بڵاووکراوەی ئەکادیمیای کوردی ٢٠١٧- ١٦٧ لاپەڕە.

-کۆکردنەوەی شەونمی شیعر، وەزارەتی ڕۆشنبیریی.

حکومەتی هەرێم، چاپی دووەم ٢٠٦ لاپەڕە، ٢٠١٩.

## ئەوانەی کراونەتە عەرەبی و ئینگلیزی

-کتاب الماء وەرگێڕانی بۆ عەرەبی محمد حوسێن ڕەسول دەزگای چاپ و بەخشی کوردی، بەغداد . ٢٠١٠

- هادئە کالکناری، وەرگێڕانی بۆ عەرەبی کۆمەڵێ نووسەر ، پێداچوونەوەی جەلال زەنگابادی- دەزگای سەردەم، ٢٠١٠.

-کتێبی ئاو وەرگێڕانی بۆ ئینگلیزی محمد حسین ڕەسول. The book of water-

- دیوانی سکڵی ناو خۆڵەمێش بە سویدی – وەرگێڕانی ڕزگار شیخانی- لە سوید چاپ بووە .٢٠١٢

- دیـوانی تـۆ هەمیشـە تـۆ بە سـویدی – وەرگـێڕانی رزگـار شیخانی- لە سوید چاپ بووە .٢٠١٣

-جـذوة الرمـاد – سـكلی نـاو خۆڵـەمێش، وەرگـێڕانی نیهـاد نەجار- چاپ و بەخشی دەزگای رۆشنبیریی بەغداد.

-عالیا عالیـا الی الاعمـاق - دیـوانی بـەرز بـەرز تـا قـووڵایی- وەرگێڕانی بۆ عەرەبی و ئینگلیزی- محمد حسین رە سوڵ.

-أخگر- سكلی ناو خۆ لەمێش – وەرگێڕانی بۆ فارسی حسین شریفی چاپ نەکراوە.

-وەرگێڕانی دیوانی - کەی ئەگەی پەیاتریس - بۆ عـەرەبی- متی تصلين يا بياتريس، وەرگێڕانی محمد حسین رسول.

ئەمـە سـەرجەمی تـەوای شـەونخوونییەکانمە لـە سـاڵی ١٩٨٠ وە تـاوەکو ئێسـتا، هەڵبـەت بەرهـەمی تریشـیان بـە دوادادێ ، ئەگەر تەمەن رێگە بدات بە چاپیان دەگەیەنم، بـە تایبـەت ئـەو چاوپێکـەوتن و سـیمینارانەی دەربـارەی ئەدەب و رۆشنبیری، رەخنەو لێکۆڵینەوەکانن.

شـیعر لای مـن ئامانجـه، ئامانجـی مرۆڤبوونـه، مرۆڤبوونیـش، پاکیـی و خۆشەویسـتییە، تـۆ باش دەزانـی مـن هەمـوو ژیانـم شـیعر بـووە، ژیانی خۆشـیی خـۆم هەڵنەبـژاردوە، بەڵکـو ژیانـی سـەختی ئەدەبییاتـم هەڵبـژارد و لـەو ڕێگەیەوەش تووشـی گەلـێ کارەسـاتی دەروونیـی و ناهەمواری بوومەتـەوە، ئـاوارەی وڵاتـان بوویمە و لـە پێناوی ئـەو سـومعەیەدا، وازم لـە هەمـوو جـۆرە ژیانێکی خـۆش هێناوە، شـیعر عەشـق و خۆشەویسـتیی و سـەربەرزییە، بۆیـە بۆمـن ئامانجـی ژیانـم بووە.

**کەریم دەشتی**